# حوكمی سەلامكردن لە ناموسڵمان

.......................................................................

لە بڵاوكراوەكانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (٦)

**نووسینی**: د. حاكم المطيري
**وەرگێڕانی**: عومەر ئەمین
**دیزاین**: ڕەوشت محەمەد
**چاپ**: ناوەندی ڕێنوێن

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە(١١٨٤)ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە

# ناوەڕۆك

# بسم الله الرحمن الرحيم

## وتەیەکی پێویست

ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەڵقەیەکە لە زنجیرەیەك بابەتی ڕەخنەگرانە کە دکتۆر حاکم ئەلموتێری بەمەبەستی چاوخشاندنەوە بەکەلەپوری فیقهی زانایاندا نوسیویەتی، ڕەنگە بۆ ئێمەی کورد ئێستا ئەم بابەتە زۆر جێگەی باسوخواس نەبێت، بەڵام گرنگیەکەی لەوەدایە ڕێنمایی ئیسلامخوازان دەکات بۆسەرلەنوێ پێداچونەوە بەبابەتە فیقهیو شەرعیەکاندا بەشێوەیەکی زانستی.

ئەمەش ڕێبازێکی بایەخدارە بۆ قوتارکردنی حوکمە شەرعیەکان لە کۆمەڵێك فەتواو ڕای سەردەمانی پێشو، کە وەك دەقی شەرعی سەیر دەکرێنو لای زۆرکەس جێگەی مشتومڕنین، کە ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەگەر شارەزاو پسپۆڕان لێکۆڵینەوەیان بکەن، دەبینین ئەو فەتوایانە جێگەی گفتوگۆو هەندێکیشیان بەڵگەکانیان تەواو لاوازن.

لەم سۆنگەوەو بەمەبەستی سەرلەنوێ خوێندنەوەو هەڵێنجانی هەندێك حوکمو چەمکی ئیسلامی، ناوەندی (خاڵ) بەباشی زانی ئەم بابەتە کە لەبنەڕەتدا توێژینەوەیەکی زانستیە بەناونیشانی (الأعلام بدراسة حديث لاتبدؤا المشركين بالسلام) وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی.

**ناوەندی هزری و ڕۆشنبیری خاڵ**

ئـــەم بابەتـــە لێکۆڵینەوەیـــەکی ڕەخنـــە گرانـــەی فـەرموودەیی یـە بـۆ فەرموودەکـەی سـوهەیلی کـوڕی ئـــەبی صـــاڵح، لـــە ئـــەبوو هـــورەیرەوە دەگێڕێتـــەوە (لاتَبدَؤوا المُشرِكينَ بالسَلامِ) واتـە (دەستپێـشخەرمەبن لە سەلام کردن لە هاوەڵدانەران).

ئەوانەی سەلامکردن لەبێ بڕوایان بەدروسـت نـازانن ئـەم فـەرمودەیان کردوەتـە بەڵگـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کۆمەڵێك فەرمودەی (صحیح) دروست هەیە، کە تیایـدا فەرمان دەکەن بەسەلام کردن، کە لەنێوانیاندا دژایەتی بەدی دەکرێت، لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵـەر هەسـتاوە بـە لێکۆڵینـــەوە لـــەم فـــەرموودەداو جیاوازیەکـــەی ڕون کردوەتەوەو هەوڵی داوە ئەم فـەرمودەو فـەرمودەکانی تر پێکەوە (جمع) کۆبکاتەوە.

# پێشەکی

سـوپاس‌و سـتایش بـۆ پـەروەردگاری جیهانیـان‌و سـەلات‌و سەلامی خودای گەورە بۆ سەر پێغەمبەرو ئـالو بـەیت‌و هـاوەڵ‌و شوێن کەوتوانی تاڕۆژی دوایی.

ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەگرانەی فەرموودەییـە بـۆ فەرمودەکەی سوهەیلی کوڕی ئـەبی صـالّح کەدەیگێڕێتـەوە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (لاتَبْـدؤوا المُـشْرِكينَ)–وفي روايـة (اليهـود والنـصارى– بالـسلام وإذا لقيتمـوهم فاضـطروهم الى أضـيق الطريق) واتە: (سـەلام مەکـەن لـە هاوەڵدانـەران) لەڕیوایـەتێکی تـردا (لەجولەکـەو گـاوران، وە هــەر کاتێـك پێیـان گەشـتن ڕێگاکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن)

ئاشکرایە ئەمڕۆ پێویستە حوکمی ئەم بابەتە بزانین، لەکاتێکـدا گـەل‌و نەتـەوەکان تێکەڵیـەکی زۆریـان هەیـە لـەنێوان یـەکتردا کـە پێشتر نەبووە، ئەمڕۆ موسڵمانان لە هەموو وڵاتاندا بڵاوبونەتـەوە، تێکەڵن‌و کاردەکەن لەگەڵ خاوەن دینەکانی ترداو توشی ئیحراجی دەبـن ئەگـەر سـەلام نەکـەن، بەتایبـەت کاتێـك ناچـاردەبن بـچنە ناویان‌و سەردانی ماڵ‌و کاروبارەکانیان بکەن، چونکە فەرمودەکە

دەفەرموێت (سەلامیان لێ مەکەن)، ئەمیش لە ڕواڵەتدا پێچەوانەی گشتی دەقەکانی قورئان‌و سونەتە، کە فەرمان بەسەلام کردن دەکەن.

ئیبن حەجەر جیاوازی زانایانی پێشینی باسکردوە لەم بابەتەداو دەڵێت: (سەلام نەکردن لە بێ باوەڕان بەڕونی نەهی لێ کراوە وەك ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوەوئیمامی بوخاریش لە (الادب المفرد)دا لەڕێگەی سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح لەباوکی یەوە لە ئەبو هورەیرەوە کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوەو فەرمویەتی (لاتبدءوا اليهود والنضارى بالسلام واضطروهم إلى أضيق الطريق) واتە: (واتە سەلام مەکەن لە جولەکەکان‌وو گاورەکان‌و ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاریێ یان کەن).

کەچی هەندێك: وتویانە: دروستە سەلام لێ کردنیان، وەك ئیمامی طەبەری کە دەگێڕێتەوە لە ڕێگەی ئیبن عویەینە ووتویەتی: (دروستە سەلام کردن لە بێ بڕوا وەك خودای گەورە دەفەرموێت: (لا يَنْهَاكُمُاللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ)[١] واتە: (خوداڕێگەی‌لەئیوەنەگرتوە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شەڕیان لەگەڵدا نەکردون).

---

[١] سورة الممتحنة الاية (٨)

هەروەك ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) بە باوكی فەرموە (سلام علیك)[1] واتە (سەلامت لێ بێت).

ئیمامی بەیهەقی دوای ئەوەی ئەم فەرمودەی ئەبو ئومامە دەگێڕێتەوە (ئەبو ئومامە گەشتووە بە هەركەسێك سەلامی لێ كردوە) لەم بارەیەوە پرسیاریان لێ كردوە ئەویش ووتویەتی: (خوای گەورە سەلامی كردوە بە سڵاو كردن بۆ ئێمەو پەنادان بۆ ئەهلی زیمە)[2]، دەڵێت: ئەمە ڕای ئەبو ئومامەیەو فەرمودەكەی ئەبو هورەیرە لەپێشترە، (قاضی عییاض)وەڵامی ئایەتەكەو ووتەكەی ئیبراهیم پێغەمبەری ﷺ داوەتەوە كە مەبەست وازهێنانو دوركەوتنەوەیە نەك سەلام كردن.

هەندێك ووتویانە: ئەم ئایەتە(فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ)[3]. واتە: جا تۆ وازیان لێ بێنەو بڵێ، لەمنەوە هەر لە ئاشتیو بێ زیان بۆ ئێوە، بەم زوانە دەزانن چیان كردووەو بەرهەمی وەردەگرنەوە)، هەڵوەشاوەتەوە بە ئایەتی قیتال[4].

---

[1] سورة مريم الاية (٤٧)

[2] زیمی: ئەو خاوەن ئاینانەن لەسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیاون.

[3] سورة الزخرف الاية (٨٩)

[4] فتح الباری ١١\٣٩

جیاوازی نێوان بەڵگەکان بەسەلام کردنو نـەکردن گەشـتووەتە ئاستێك دەڵێن: سەلام کردن هەڵوەشاوەتەوە، یان تایبەت کـراوە، هەندێکی تر ئایەتەکان تەئویل دەکەن، ئەم جیاوازیە لەسـەردەمی هـاوەڵانو شـوینکەوتوانەوە سـەری هەڵـداوە، بـەهۆی جیـاوازی تێگەشـتنیان لـە دەقـەکان، هەربۆیـە پێویـستە لێکۆڵینـەوە لـەم فەرمودەیــە بکرێــتو مانــا دروســتەکەی بزانرێــت بــۆ ئــەوەی جیاوازیەکە نەمێنێتو یەکبگرێت لەگـەڵ دەقـە قورئانیـەکانو ئـەو فەرموودانەی (صحیح) دروسـت تـرو ماناکانیـان ڕونـترە، جـا ئـەم بابەتە کراوە بە پێنح بەشەوە:

**بەشی یەکەم:** تەخریجی ڕیوایەتەکانی فەرمودەکەی سوهەیلی کـوڕی ئەبی صالح.

**بەشی دووەم:** دەقە پێچەوانەکانی فەرمودەکەی سوهەیل.

**بەشـــی ســـێ یـــەم**: ڕون کردنـــەوەی ڕوی فەرمودەکـــەی ســـوهەیلو ئاشکراکردنی کەمو کوڕیو ناتەواویەکەی.

**بەشی چوارەم**: ئەو فەرمودانەی هاتووە لە وەڵام دانـەوەی سـەلامی نـا موسڵمانان دا.

**بەشی پێنجەم**: ڕای پەسەندو ڕاجیح.

**دکتور: حاكم المطيري**

**استاذ مساعد بقسم التفسير والحديث**

**كلية الشريعة جامعة الكويت**

# بەشی یەکەم:
# تەخریجی ڕیوایەتەکانی فەرمودەکەی سوهەیل

ئەو فەرمودەیە بەم شێوەیە تەنها لەڕێگەی سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح لە باوکی لە ئەبو هورەیرەوە هاتووەو ڕاویەکانی جیاوازن لە گێڕانەوەیدا.

## ١- سوفیانی سەوری لە سوهەیلەوە دەیگێڕێتەوە

– وەکیعو ئەبو نەعیم دەڵێن: سوفیان بۆی گێڕاینەوە لە سوهەیلەوە بەم شێوەیە (إذا لقيتم اليهود في الطريق فاضطروهم إلى أضيقها ولا تبدؤوهم بالسلام) واتە: (هەرکاتێك گەشتن بەو جولەکانە لە ڕێگەکەدا، ئەوا ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاریێ یان بکەنو دەستپێشخەرمەبن لە سەلام لێکردنیان).

ئەبو نەعیم دەیگێڕێتەوە بە (إذا لقیتم المشركين في الطريق فلا تبدؤوهم بالسلام واضطروهم إلى أضيقها)[1]. واتە: (هەركاتێك لەڕێگەكەدا گەشتن بە هاوەڵنەداران ئەوا دەسپێشخەر مەبن لە سەلام لێكردنیانو ڕێگەكەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێیان بكەن).

- عەبدوڕڕەزاق لە سوفیانەوە دەیگێڕێتەوە (إذا لقيتم المشركين في طريق فلا تبدؤوهم بالسلام وآضطروهم الى أضيقها)[2]. واتە: (هەركاتێك گەشتن بە هاوبەش دانەران لەڕێگەیەكدا ئەوادەستپێشخەرمەبن لە سەلام لێ كردنیانو ڕێگەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێ یان كەن).

- یەحیای كوڕی ئادەم لە سوفیانەوە وەكو ڕیوایەتەكەی ئەبو نەعیم[3].

- محمدی كوڕی كەسیر لە سوفیانەوە جارێك وەكو ڕیوایەتەكەی عەبدوڕڕەزاق بە (طَرِيقْ) هێناویەتیو جارێك وەكو

---

[1] أحمد في المسند ٢/٤٤٤ عن وكيع وأبي نعيم، والبخاري في الأدب المفرد –ح– رقم ١١١١ عن أبي نعيم. ومسلم في الصحيح ح رقم ٢١٦٧ من طريق وكيع.

[2] المصنف –ح– رقم ٩٨٣٧.

[3] أحمد في المسند ٢/٥٢٥

ڕیوایەتەکـەی یـەحیای کـوڕی ئـادەم لـە ئـەبوو نەعیمـەوە بـە (الطَّریقْ) گێڕاویەتیەوە.[1]

- محمـدی کـوڕی یوسـفی فـەریابی لـە سـوفیانەوە وەکـو ڕیوایەتەکەی یەحیای کوڕی ئادەمو ئەبو نەعیم هێناویەتی.[2]

ئەم پێنج (حافِظ) حافیزە لە هـاوەڵانی سـوفیانی سـەوری ن —ئەبو نەعیمو ئیبن کەسـیرو فـەریابیو یـەحیای کـوڕی ئـادەمو عبدوڕڕەزاق— دەیگێڕنەوە بە (إذا لقیتم المشرکین في الطریق فلا تبـدؤوهم بالـسلام وأضـطروهم الى أضـیقها). واتـە: (هـەرکاتێك لەڕێگەکەدا گەشتن بە هاوەڵ دانەران ئەوا دەسپێشخەری مەکەن لە سەلام لێ کردنیـان ڕێگەکـەیان لێ تەسـك بکەنـەوەو لاڕێ یـان کـەن)، بـەڵام وەکیـع بـە پێـچەوانەی ئەمانـەوە لـە سـوفیانەوە دەڵێــت: (الیهــود) جولەکــەکان لــە جیــاتی (المــشرکین) هاوەڵدانــەران، عبـدولڕەزاق دەڵێـت (طریـق) ڕێگـە لـە برێتـی (الطریق) ڕێگەکە، محمدی کوڕی کەسیر لە ڕیوایەتی ئیبنوسونی لەگەڵیدایـە، وە لـە ڕێوایـەتی بەیهـەقی بـە پێـچەوانەوە دەڵێـت (الطریق) ڕێگاکە.

---

[1] ابن السني في عمل اليوم والليلة ح رقم ٢٤٠ كرواية عبد الرزاق، والبيهقي في شعب الإيمان ح رقم ٩٣٨١ كرواية يحيى بن آدم وأبي نعيم.

[2] البيهقي في السنن الكبرى ٩\٢٠٣

جیاوازیەکە ڕونە لەنێوان (المشركين)و (اليهود)، هەروەها لەنێوان (الطريق) کە ناسراوە، واتە: ڕێگاو بانەکانیان لەو کاتەداو (طريق) کە نەناسراوە، واتە: هەر ڕێگایەك، وە دەتوانرێت پێکەوە کۆ بکرێنەوە، مەبەست هەر ڕێگایەك لەو ڕێگاو بانەی ئەو کاتەیان، لەکاتێکدا پێویستە پێکەوە کۆبکرێنەوە بێگومان ڕیوایەتی ئەو کۆمەڵە ڕاسترە لە ڕیوایەتەکەی عبدلڕەزاق، هەروەك بەڕونیش لە لێکۆڵینەوەی فەرمودەکەدا دەردەکەوێت.

## ٢- شوعبەی کوڕی حەججاج:

کۆمەڵێك لە هاوەڵانی لێیان گێڕاوەتەوە کە ئەمانەن:

- ئەبو داودی طەیالیسی لە شوعەیبی کوڕی سوهەیل لە باوکی لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەسەر خاوەن کتێبەکان فەرمویەتی: (لا تبدؤوهم بالسلام وإذا لقيتوهم في الطريق فاضطروهم إلى أضيقها)[١]. واتە: (دەسپێشخەر مەبن لەسەلام لێ کردنیان وە هەرکاتێك لەڕێگەکەدا پێ یان گەشتن، ئەوا ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن).

---

[١] مسند الطيالسي ح رقم ٢٤٢٤.

- عـەففانی کـوڕی موسـلیم دەڵێـت: شـوعبە پـێی ووتم: سوهەیل هەواڵی پێ داوەو دەڵێـت: لەگـەڵ باوکیـدا ڕۆشـتین بـۆ شام، خەڵکی شام ئەیاندا بەلای کەنیسەداو سەلامیان لێدەکرد، منیش گوێم لە باوکم بوو ووتی: گوێم لە ئەبوهورەیرە بوو ووتی: گـوێم لــە پێغەمبــەر ﷺ بــوو فــەرمووی (لاتبــدؤوهم بالــسلام واضطروهم إلي أضيقها)[1]. واتە: (دەسپێشخەر مەبن لە سەلام لێ کردنیان‌و ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن).

- محمدی کوڕی جەعفەر دەڵێ: شوعبە دەربارەی خاوەن کتێبــەکان لــە پێغەمبــەرەوە ﷺ بــۆی گێڕامــەوە (لاتبــدؤوهم بالــسلام وإذا لقيتمـوهم في طريـق فاضــطروهم الــي أضــيقها)[2]. واتــە:(دەسپێـشخەر مـەبن لـە سـەلام لێ کردنیـان سـەلامیان لێ مەکـەن، هـەرکاتێك لەڕێگەیەکـدا پـێ یـان گەشـتن ڕێگـەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن).

- حەفصی کوڕی عومەر دەڵێ: شوعبە بۆی گێڕامـەوە لـە سوهەیل دەڵێت: لەگەڵ باوکمدا ڕۆشـتم بـۆ شـام، خـەڵکی شـام کاتێــك ئەیانــدا بــەلای پەرســتگەی گاورەکانــدا ســەلامیان لێ

---

[1] أحمد في المسند ٣٤٦/٢ ح ٨٥٤٢.

[2] أحمد في المسند ٤٥٩/٢ ح ٩٩٢١. ومسلم في صحيحه ح رقـم ٢١٦٧ عـن محمـد بن المثنى عنه.

دەکـردن، بـاوکم ووتــی: ســەلامیان لێ مەکـەن، بەڕاسـتی ئـەبو هــورەیرە بـۆی گێڕامــەوە لــە پێغەمبــەرەوە ﷺ فەرمویــەتی: (لاتبـدؤوهم بالـسلام وإذا لقيتمـوهم في الطريـق فأضـطروهم الـي أضيق الطريق)[1] واتە: (دەسپێشخەر مەبن لە سەلام لێ کردنیان، هەرکاتێك پێ یان گەشتن لەڕێگەکەدا، ئەوا ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاریێ یان کەن).

– وەهــەبی کــوڕی جــەریر لــە شــوعەیبەوە بــەم شــێوە دەیگێڕێتـــــەوە: (لاتبـــــدؤوهم بالـــــسلام، یعـــــني اليهـــــود والنصاری)[2]واتە: سەلامیان لێ مەکەنو واتە: جولەکەو گاور).

– عبدولصەمەدی کوڕی واریـس لـە شـوعبەوە دەگێڕێتـەوە (لاتبدؤا أهل الكتاب بالـسلام، وإذا رأيتمـوهم في طريـق فاضـطروهم إلـي أضـيقها)[3] واتــە: (ســەلامیان لێ مەکـەن، هــەرکاتێك پــێ یـان گەشتن لە ڕێگەیەکدا ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاریێ یان کەن).

– ئەبو وەلیدی طەیالسی لە شـوعبەوە وەك ڕیوایەتەکـەی محمدی کوڕی جەعفەر[4].

---

[1] أبو داود في السنن ح رقم ٥٢٠٥.

[2] الطحاوي في شرح معاني الآثار ٣٤١/٤.

[3] ابن حبان كما في الإحسان بترتيب صحيح ابن ح رقم ٥٠١.

[4] ابن السني في عمل اليوم والليلة –ح– رقم ٢٤٠.

- محمدی کوڕی جەعفەر

- ئەبو وەلید لە شوعبەوە بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: (لاتبدؤوهم بالسلام وإذا لقيتموهم في طريق فاضطروهم الى أضيقه يعنى اليهود والنصارى)[1] واتە: (دەسپێشخەر مەبن لە سەلام لێ کردنیان، هەرکاتێك لە ڕێگەیەکدا پێ یان گەشتن ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لارێ یان کەن) مەبەست: (جولەکەو گاورەکانە).

وەلای زۆربەی هاوەڵانی شوعبە دیاری نەکراوە مەبەست لێی کێیە، بەڵام ڕاویەکە ڕونی کردوەتەوە کە مەبەست (جولەکەو گاورەکانە) وەك بڵێی لەناو گێڕانەوەکەی ئەبوو هورەیرە باسیان نەکراوە، بەڵکو تەنها نەهی کراوە لە سەلام لێ کردنیان، وە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بەسەرهاتێك هەبووە سوهەیل کورتی کردوەتەوە، یان لەبیری چووە جیاوازیش هەیە لەنێوان (لاتبدؤوا اليهود والنصارى بالسلام) کە گشتی دەگەیەنێت وە (لاتبدؤوهم بالسلام) کە باس لە تاقمێکی دیاری کراویان دەکات – بە بەڵگەی ئەوەی دەست نیشانی نەکردوون– لەوکاتەداو بەهۆیەك لە هۆکان فەرمویەتی سەلامیان لێ مەکەن.

---

[1] ابن عساكر في تاريخ دمشق ٢٤٦/٤١ وإسناده صحيح إلى شعبة.

## ٣- عەبدولعەزیر دەراوەردی

لە سوهەیلەوە بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە (أن رسول الله قـال: لا تبدؤوا اليهود والنصارى بالسلام، فإذا لقيـتم أحـدهم في طريـق فاضــطروهم الى أضــيقها) واتــە: (ســەلام مەكــە لــە جولەكــەو گاورەكان، هەركاتێك لەڕێگەیەكدا بەیەكێكیان گەشـتن ڕێگـەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێ یان كەن). ئەمە لای ئیمـامی موسـلیم، وە لای تیرمیزی بە (وإذالقيتم أحـدهم في الطريـق فاضـطروهم الى أضـيقه)[1] واتــە: (وە كاتێـك لەڕێگەیەكـدا بەیـەكێكیان گەشــتن ڕێگەكەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێ یان كەن) هاتووە.

## ٤- ئەبو عوانە وەچاحی یەشكری:

لە سوهەیلەوە دەگێڕێتەوە: (لابتدؤا أهل الكتاب بالسلام فإذا لقيتموهم في طريق فأضطروهم إلى أضيقه)[2] واتە: (سەلام مەكـەن لە خاوەن كتێبەكان، جا هەركاتێك لە ڕێگەیەكدا پێیـان گەشـتن ڕێگەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاریَ یان كەن).

---

[1] صـحيح مـسلم –ح– رقـم ٢١٦٧، والترمـذي في الـسنن –ح– رقـم ٢٧٠٠ وقـال (حسن صحيح).

[2] الإحسان بترتيب صحيح ابن حبان ح رقم ٥٠٠.

## ٥- جەریری کوڕی عەبدولحمید، لە سوهەیلەوە:

ئیمامی موسلیم دەڵێت: فەرمودەکەی جەریر (إذا لقيتموهم ولم يسم أحد المشركين)[١] واتە: (هەرکاتێك پێ یان گەشتن، ناوی کەسی نەهێناوە لە هاوەڵ دانەران).

لای بەیهەقی بەم شێوەیە هاتووە (إذا لقيتموهم فلا تبدؤوهم بالسلام وأضطروهم الى أضيق الطريق) واتە: (هەرکاتێك پێ یان گەشتن ئەوا سەلامیان لێ مەکەن‌و ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێیان کەن). دەڵێت: ئەمە لەوەصف دا بۆ گاورەکانە، وە ئێمە بۆ هاوەڵدانەرانی دەبینین[٢].

ئەم ڕیوایەتەش وەك ڕیوایەتەکەی شوعبەی کوڕی حەجاجە، ئەوە دەسەلمێنێت کە سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح بەناڕونی گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵانی دەفەرموێت، دەربارەی کۆمەڵێکی تایبەت‌و ناسراو لای هاوەڵان، کە نابێت سەلامیان لێ بکەن، بەبێ ئەوەی باسی بەسەرهاتەکەو ئەوانەی نەهی یان لێ کراوە بکات، بەڵام جەریر جاروبار تەفسیری دەکات‌و دەڵێت: مەبەست: ئەو کەسانەو ئەو کەسانەیە.

---

[١] صحيح مسلم ح رقم ٢١٦٧.

[٢] البيهقي في السنن الكبرى ٩\٢٠٣ ح ١٨٥٠٦ ورواه أيضا في الآداب ح رقم ٦٦٩.

### ٦- مەعمەری کوڕی ڕاشید

لــە ســوهەیلەوە بــەم شــێوەیە دەیگێڕێتــەوە (لاتبــدؤوا الیهــود والنــصاری بالــسلام، فــإذا لقیتمــوهم في طریــق فأضــطروهم الى أضیقها)[1] واتە: (سەلام مەکەن لە جولەکـەو گاورەکـان، هـەرکاتێك لەڕێگەیەکدا پێ یـان گەشـتن، ئـەوا ڕێگـەیان لێ تەسـك بکەنـەوەو لارێ یان کەن).

٧- **وهەیبی کوڕی خالید** دەڵێ: سوهەیل بـەم شـێوەیە بـۆی گێڕاینەوە (أهل الکتاب لاتبدؤوهم بالـسلام، واضـطروهم الى أضـیق الطریـق)[2] واتــە: (دەسپێــشخەر مــەبن لەســەلام کــردن لــە ئــەهلی کیتاب، ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن).

٨- **یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری** دەڵێ: سـوهەیل بـۆی گێڕامــەوە (لاتبــدؤوا الیهــود والنــصارى بالــسلام، وإذا لقیتمــوهم في الطریق فاضطروهم الى أضیقه)[3] واتە: (سەلام مەکەن لـە جولەکـەو

---

[1] عبدالرزاق في المصنف ح رقم ٩٨٣٧ وقرنه بالثوري وساق لفظ الثوري، وأحمـد في المسند ٢\٢٦٦ عن عبد الرزاق عن معمر وحده وهذا لفظه.

[2] البخاري في الأدب المفرد —ح— رقم ١١٠٣.

[3] فوائد تمام ح رقم ٩٠٩ من طریق إسماعیل بن عیاش ویذید بـن یوسـف کلیهمـا عـن یحیـی بـن سعید، وإسماعیل في حدیثه عن غیر الشامیین ضعیف وقد صحح الإمام أحمد حدیثه عن یحیـی بن سعید کما في تهذیب التهذیب ٢٨٢/١ (قال عبد الله بن أحمد سئل أبي عنه فقـال: نظـرت في کتابه عن یحیي بن سعید أحادیث صـحاح، وفي المـصنف، یعـني: مـصنف إسماعیـل أحادیـث

گاورەکان هەرکاتێك لە ڕێگەکەدا پێ یان گەشتن، ئەوا ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوەو لارێ یان کەن).

٩- **شەریکی کوڕی عبدالله ی قاضي**

١٠- **ئەبوبەکری کوڕی عەیياش**

١١- **یەحیای کوڕی ئەیوب**

لە سوهەیلەوە دەگێڕنەوە (لاتبدؤوهم بالسلام) يعني:(اليهود والنصارى)[1]، واتە (سەلامیان لێ مەکەن) مەبەست: جولەکەو گاورەکان.

١٢- **زوهەیری کوڕی موعاویە** لە سوهەیل لە باوکی لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إذا لقيتموهم فلا تبدؤهم بالسلام واضطروهم الى أضيقها) واتە: (هەرکاتێك پێ یان گەشتن، ئەوا سەلامیان لێ مەکەن وە ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن) بەزوهەیرم ووت: جولەکەو گاورەکان؟ ووتی: هاوەڵ دانەران)[2].

---

مضطربة... وقال: دحيم إسماعيل في الشاميين غاية وخط عن المدنيين وكذا قال البخاري والدولابي ويعقوبن شيبة وقال ابن عدي إذا روى عن الحجازيين فلا يخلو من غلط إما أن يكون حديثا برأسه أو مرسلا يوصله أو موقوفا يرفعه وحديثه عن الشاميين إذا روى عنه ثقة فهو مستقيم وهو في الجملة ممن يكتب حديثه ويحتج به في حديث الشاميين خاصة)، وقد توبع في حديثه هذا، كما صرح بالسماع، فزال ما يخشى من التدليس والوهم.

[1] الطحاوي في شرح معاني الآثار ٣٤١/٤.

[2] علي بن الحعد في المسند ح رقم ٢٦٧٢.

## ڕونكردنەوەی لایەنە جیاوازەكانی فەرمودەكەی سوهەیل:

ئــەم ڕیوایەتانــەی ســوهەیل هــەمویان ڕاســتن، وە زۆربــەی ڕاویــەكانی پێــشەواو (حــافظ) حــافیزن جیاوازیــان هەیــە لــە گێڕانەوەی فەرمودەكەی سوهەیل لە چەند ڕویەكەوە:

١- جارێك دەڵێ: (المشركين) وەك زوهەیری كوڕی معاویــەو هــاوەڵانی ســوفیانی ســەوری لێــی دەگێڕنــەوە، هــەروەك چــۆن جــەریری كــوڕی عەبدولحەمیــد بــە (مــشركين) هاوەڵدانــەران تەفسیری دەكات.

٢- جارێــك دەڵــێ: (أهــل الكتــاب) هــەروەك ئــەبو عوانــەو وهەیبی كوڕی خالید دەیگێڕنەوە.

٣- جارێــك دەڵــێ: (اليهــود والنــصارى) وەك لــە ڕیوایــەتی دەراوەردیو مەعمەرو زۆربەی ڕاویەكانی سوهەیل دا هاتووە.

٤- جارێــك دەڵــێ: (اليهــود) وەك لــە ڕیوایــەتی وەكیــع لــە سوفیان سەوری دا هاتووە.

٥- جارێــك نــاوی كــەس ناهینێــت وەك ڕیوایــەتی جــەریری كوڕی عبدولحەمید وتی: ئێمە بۆ هاوەڵدانەرانی دەبینین.

٦- لە ڕیوایەتی شوعبە لەبەسەرهاتی سوهەیل لەگەڵ بــاوكی، كاتێــك لــە شــام تێدەپــەڕین بــەلای پەرســتگەیەكدا ووتــی: ئــەبو هورەیرە ووتی: پێغەمبــەر ﷺ فەرمویــەتی (لا تبــدؤوهم بالــسلام)

واتـــە: (ســـەلامیان لێ مەکـەن) پرسـیار کـرا لــە شـوعبە دەڵێـت: جولەکەو گاورەکان، جارێکیش دەڵێت: خاوەن کتێبەکان.

فــەرموودە ناسـەکان ئـەم فـەرمودەی سـوهەیل بـە (مـشهور) دەزانـــن، کاتێـــك ســـەوریو شـــوعبەو مەعمـــەرو کەســـانی تـــر دەیگێڕنەوە، جیاوازیان هەیـە لـە لـەفزی فەرمودەکـەدا، هـەروەك ئیمامی موسـلیم ووریـایی داوە لەسـەریو دەڵێـت: (فەرمودەکـەی وکیع (اذا لقیتم الیهود)) واتە: (هەرکاتێك گەشتن بـە جولەکـەکان) لــە فەرموودەکـەی جەعفـەر لــە شـوعبەوە (اهــل الکتـاب) واتــە: (خـاوەن کتێبـەکان) وە لــە فەرمودەکـەی جـەریر (إذا لقیتمـوهم) واتە: (هەرکاتێك پـێ یـان گەشـتن) وە نـاوی کەسـی نـەهێناوە لـە هاوەڵدانەران[1].

فــەرموودە ناســان بەدواداچـونیان کـردوە بـۆ فەرمودەکـەو پرسـیاریان لــە هــاوەڵانی سـوهەیل کـردوە ئەوانــە کـێن؟ وەك ڕیوایەتەکەی جەریرو سوهەیل، کاتێك پرسیاریان لێ کرا: ئەوانـە کێن؟ ووتیان: (جولەکەو گاورەکان)ن، وەك ڕیوایەتەکـەی ئـەبو عوانــەو ووهبــی کــوڕی خالیـد هــاتوە، یـان مەبەسـت (هــاوەڵ دانــەرانن) وەك لــە ڕیوایەتەکـەی زۆرێـك لــە هــاوەڵانی سـوفیان

---

[1] صحیح مسلم ح رقم ٢١٦٧.

سەوری هاتووە، یان مەبەست (جولەکەیە) وەك لە ڕیوایەتەکەی وەکیـع دا هـاتووە، لـە وەڵامـدا دەڵـێن: وەك زوهـەیر دەڵێـت: مەبەست (هاوەڵدانەرانـە) یـان جـەریر دەڵێـت: (ئەمـە سـیفەتی گاورەکانەو ئێمە لە (هاوەڵدانەران) دا دەیبینـین. واتـە: ئێمـەی هاوەڵانی سوهەیل ئەوەی لێمان بیستووە  بە دیـاری نـەکراوی‌و شـــاراوەیی هێناویـــەتی‌و وا دەیبیـــنین مەبەســـت هـــەموو (هاوەڵدانەرانە) هەرچەند لەبەسەرهاتەکەدا ئەوان داویانە بـەلای گاورەکانی شام دا... هتد.

شــوعبەش دەڵێــت: (گــاورو جولەکــەکان) یــان (خــاوەن کتێبەکان)، بەڵام لـە ڕیوایەتەکـەی شـوعبەدا (لا تبـدؤوا الیهـود والنصاری) واتە: (سەلام مەکـەن لـە جولەکـەو گاورەکـان) یـان (لاتبـدؤوا أهـل الکتـاب)  واتــە: (ســەلام مەکــەن لــە خــاوەن کتێبــەکان) نــەهاتووە، بــەڵکو ئــەوەی لــە فەرموودەکــەی پێغەمبەرﷺهاتووە (لاتبـدؤوهم بالـسلام) واتـە: (سـەلامیان لێ مەکەن) جا ئەبو صاڵح بەکاری هێناوە بۆ گاورەکانی شام‌و ئـەم فەرمودەی بە بەڵگە هێناوەتەوە.

زانایـان لەکۆنــەوە جیاوازییـان هەیـە لەســەر سـوهەیل، وە جیاوازی نێوان ڕیوایەتەکان جیاوازیی جودایی‌و لێك نەچونە نەك جیاوازی جۆری، وشەی (المشرکین) گشتیترە لە (أهـل الکتـاب)

یان (الیهود والنصاری) ئەمەش گشتی ترە لە (الیهود)، ئەو ڕیوایەتانەی بە شاراوەیی هاتووە دەگونجێت کاتو ساتو شوێنی قسە بۆ کراوان —هاوەڵان—ی مەبەست بوبێ، ئەمەش تایبەتە بەو کاتو ساتو شوێنەوەو گشتیی نیە، بەڵام ڕیوایەتەکانی تر گشتی دەگەیەنێتو ناتوانرێت پێکەوە کۆبکرێنەوە، یان یەکێکیان (ترجیح) سەربخرێت بەسەر ئەوانی تردا، چونکە ڕاویەکانی سوهەیل لە پێشەوایانو (حفاظ)ن، وە ئەگەر ناچار بوو (ترجیح) سەربخرێت ئەوا بەهێزترین ڕیوایەتەکان ڕیوایەتی (المشرکین)و ڕیوایەتی (الیهود والنصاری)یە، جیاوازی نێوانیان جیاوازی جودابیە وەك جیاوازی نێوان (گشتیو تایبەت)دا، ئەمەش جیاوازی یە لە سیفەتو جۆرێکە لە جیاوازیو بڕیارەکەی پێ جیاواز دەکرێت، هەروەك ئیبن صەلاح لە (زیادة الثقة)دا ووتویەتی[1].

جا چۆنە ئەگەر جیاوازیەکە لەنێوان کۆمەڵێك زانای (حُفاظ)بن؟ کارەکە قورستر دەبێت، چونکە پەیوەندی بەخودی ڕاویەکەوە هەیە، نەك ئەوانەی لێ ی دەگێڕنەوە.

---

[1] علوم الحدیث النوع السادس عشر.

ئــــەم جیـــاوازیو نـــاڕێکی یـــە پێویـــستی بـــە وردەکاریـــە لەڕیوایەتەکەدا، ئەگەر نەدەکرا ڕیوایەتەکە وەرنـەگیرێت، هـەروەك ئیبن حەجەر دەڵێت: (جیاوازی نێوان ڕەخنەگران بێ زیانە، ئەگەر بەڵگـە هــەبوو بەسەرخــستنی یــەکێك لــە ڕیوایەتــەکان یــان کــرا کۆبکرێنەوە بەپێی یاساکانیان)[1] وە دەڵێت: (تەنها جیاوازی نابێتە لەکەو لاوازی) [2]وە هەندێ جیاوازیو نـارێکی نابێتـە لاوازی، بـەلاّم ناتوانرێـت ئـەم ڕیوایەتانـەی سـوهەیل پێکـەوە کۆبکرێنـەوە، بـە خستنە سـەری گـشتی بـۆ تایبـەت، چـونکە یـەك فەرمودەیـەو لـە باوکی یەوە گێڕاویەتیەوە گرنگ زانینـی مەبەسـتی شـەرعیە، نـەك (أجتیهاد) هەڵێنجانو تێگەشتنو بۆچونی ڕاویەکە، کەواتە یـان لـە –باوکی یەوە بە (المشرکین) یان بـە (الیهـود والنـصاری) لەبـەری کردوە، وە ئەگەر ئەمە زانرا– چـونکە هـەموو ڕاویـەکان (حـافظ)و سـیقەن بەهــەردو لـە فزەکـە (المـشرکین) وە (الیهـود والنـصاری) گێڕاویانەتـــەوە، ئەمـــەش نـــارێکی ڕیوایەتەکـــەی ســـوهەیل دەگەیەنێتو پێویـستە بوەسـتین تیایـدا، هـەتا شـێوەی دروسـتی فەرمودەکــە دەردەکــەوێ بــەپێی پاڵپــشتو بنــەماکانی تــری فەرمودەناسـی، وە ئەگـەر یـەکێك لـە ڕیوایەتـەکانی بـە شـاهیدو

---

[1] مقدمة فتح الباري ص٣٦٦.

[2] مقدمة فتح الباري ص٣٤٦.

پاڵپشتەکانیەوە (ڕاجح)بوو، ئەوا (ترجیح)ی (محفوظ)[1] نیە لەسەر (شاذ)[2] کەواتە (ترجیح)ی یەکێك لە ڕیوایەتەکانی بەسەیر کردنی گێرەرەوەکانی نیە، لە ڕوانگەی پێشخستنی ڕیوایەتی (أحفظ)یان زۆرینە نابێتە (محفوظ)و ئەویتر بە (شاذ)، بەڵکو بە بەڵگەی دەرەکی نا پەیوەست بە فەرمودەکەی سوهەیل کە لایەنی ناتەواوی ڕیوایەتەکەیم دەرخستووەو ناڕێکی یەکەی لەسەر لانابات بەهۆی لەبیرچونو لاوازی لەبەرکردن، هاوکات ڕیوایەتە ڕەد کراوەکە دەبێتە (منکر)[3] بەهۆی ئەوەی تەنها سوهەیل گێڕاویەتیەوە، وە نابێتە (شاذ) بەو هۆیەی ئەوانەی لێ یان گێڕاوەتەوە لەو سیقەتر بوون.

[1] المحفوظ: ماروﺍﺓ الأوثق مخاللفًا لرواية الثقة بزيادة في المتن أو في السند.

[2] الشاذ: رواية الثقة مخالفًا لمن هوأوثق منه

[3] الحديث المنكر: مارواهُ الضعيف مخاليفا للثقة.

## وتەی پێشەوایان لەسەر سوهەیل

سوهەیل لەگەڵ عەدالـەتو ڕاسـتگۆییدا پێـشەوایان قـسەیان لەسەر (ضبط)و لەبەرکردنو لەبیرچونەوەی کردوە.

ئـەبو حـاتم؟ دەڵـێ: (فەرمودەکـەی دەنوسـرێتو ناکرێتـە بەڵگە)[1]

ئیبن مەعین دەڵێ: (کاری پێناکری)[2].

ئەم قسە لەسەرکردن و بریندارکردنەی بۆ ئەوە دەگێڕنـەوە کە توشـی لەبیرچـونەوە بـووە لـە فەرمودەکەیـداو لەبـەرکردنی گۆڕاوە، لەبەر ئەوە زانایانی فەرموودە خۆیان لە فەرمودەکـەی پاراستووە، هەروەك لە (المیزان)دا هاتوە، (ئیبن مەدینی دەڵێ: سوهەیل بەهۆی مردنی برایەکی لەلایدا، زۆرێك لە فـەرمودەکانی لەبیرچووەتەوە.

ئیبن خەیـسەمە دەڵـێ: گـوێم لـە ئـیبن مـەعین بـوو دەیـوت: زانایـانی فـەرمودە خۆیـان لـە فـەمودەی سـوهەیل دەپاراسـت، جارێك دەیوت لاوازەو جارێك پرسیاریان لێ کرد ووتی: ئەوە نیە، جگە لە ئـەویش ووتویـەتی: ئیمـامی مالـك پـێش گـۆڕانی حـاڵی

---

[1]. الجرح والتعدیل ٤/٢٤٦.

[2]. الجرح والتعدیل ٤/٢٤٦.

فەرمودەی لێوەرگرتووە)[1] لەبەر ئەمەش ئیمامی بوخاری بە بەڵگەی نەزانیوەو تەنها سێ فەرمودەی لێگێڕاوەتەوە، یەکێکیان لەگەڵ خەڵکی تردا بووەو دوانەکەی تریش لە (متابعە) کاندایە.

ئیبن حەجەر لە پێشەکی (فتح الباری)دا دەڵێت: (سوهەیلی کوڕی ئەبی صالّحی سەممان یەکێکە لە زانا دیارەکان، نەسائیو دارەقوطنی وکەسانی تر بەسیقەیان زانیوە، ئەبو حاتم دەڵێت: فەرمودەی دەنوسرێتو ناکرێتە بەڵگە، ئیبن مەعین دەڵێ خراپ نیە، بوخاری دەڵێت: بەهۆی مردنی براکەی لەلایدا توشی شۆكو لەبیرچونەوە بووە، لای بوخاری فەرمودەیەکی هەیە لەسەر (جیهاد) هاوشان لەگەڵ یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری هەردوکیان لە نوعمانی کوڕی ئەبی عەییاش لە ئەبی سەعیدەوە، دوو فەرمودەی (متابعە) هەیە لە (سکالا).[2]

ئیبن حەجەر بەکورتی دەربارەی دەڵێت: (ڕاست گۆیەو توشی لەبیرچونەوە بووە لە کۆتایی تەمەنی).[3]

---

[1] میزان الاعتدال ٢/٢٤٤.

[2] مقدمة فتح الباري ص ٤٠٨.

[3] تقريب التهذيب رقم ٢٦٧٥.

نەسـائی لەگـەڵ ئەوەشـدا بەباشـی زانیـوە فـەرمودەی لێنەگێڕاوەتەوە، بەڵام بوخاری فـەرمودەی (سـەلام نـەکردن لـە هاوەڵ دانەرانو خـاوەن کتێبـەکان)ی نەکردوەتـە سـەرباس لـە کتێبەکەیدا، وەك ئەوەی ئەم فەرمودەی سوهەیلی بـە دروسـت نـەزانیبێت، دارەقـوطنیڕەخنـەی لـە بوخـاری گرتـووە کـە فەرمودەکـەی سـوهەیلی نەگێڕاوەتـەوە لەگـەڵ ناوبـانگو عەدالەتیەکەیدا، کەچی فەرمودەی هاو ئاستەکانی سوهەیل، یان لە سوهەیل خوارتری گێڕاوەتەوە).[١]

پرسـیارکرا لـە دارەقـوطنیبۆچـی بوخـاری فەرمودەکـەی سوهەیلی نەگێڕاوەتەوە لە صـەحیحەکەیدا؟ ووتـی: (پاسـاوێکم نیە بۆی، وە نەسائی کاتێ فەرمودەکـەی سـوهەیلی باسـکردایە دەیوت: سوهەیل چاکترە لە ئەبی یەمانو یەحیای کوڕی بەکیرو خـەڵکی تـرو کتێبەکـەی بوخـاری پڕیـەتی لەمانـە، بوخـاری فەرمودەکەی سوهەیلی وازلێ هێناوەو فـەرمودەی ئـیبن بـەکیرو فولەیحی کوڕی سولەیمانی هێناوە، نـازانم بـۆ؟ پاسـاوێکم نییـە بۆی؟.

---

[١]أنظر سؤلات الحاكم للدارقطني رقم ٢٦٣.

حـــاكم دەڵێــــت: موســــلیم فــــەرمودەی زۆری ســــوهەیلی گێڕاوەتەوە، وە زۆر بەیانی لە (شەواهد)دا هێناوە).[1]

کەچی ئەم دارەقوطنی‌یەی کە ڕەخنــە لــە بوخـاری دەگرێـت خۆی فەرمودەی سوهەیلی واز لێ هێنـاوەو ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە سـوهەیل ووردەکـار نەبووەلـە فەرمودەکەیـدا (وەك ئـەوەی سـوهەیل جارێـك بـەڕێکیو باشـی گێڕاویەتیـەوەو جارێـك بـە بچڕاوی)[2] هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا بڕیـاری لێ تێك چـونی بەسـەر سـوهەیل دا داوە[3]، (هـەروەها لـە فەرمودەیـەکی تـردا دەڵێـت: (لـەوە دەچـێت سـوهەیل لێ ی تێـك چـوبێ)[4] سـەیری قسەکەی بکە (لێ ی تیکچوە) لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن حیببـان بـە صەحیحی داناوەو، تیرمیزی بە (حسن)ی داناوە.

کەواتــە هــەموو لێ تێـك چـونێك ڕەد ناکرێتــەوە، هــەروەها دارەقـوطنیلـە فەرموودەیـەکی (سـەوری)دا دەڵێـت: (سـەوری بەڕەحمەت بێت لێی تێك چووەو سەنەدەکەی نەچەسپاوە).[5]

---

[1] سير الأعلام للذهبي ٥٤٦٠، وسؤلات السلمي للدارقطني رقم ١٥٤.

[2] العلل ١٠١٧٩.

[3] لعلل –ح– رقم ٣٢٥٩.

[4] العلل ١٦٢/١٠.

[5] العلل ٨٦/٤.

وه لـه فەرمودەیـەكی سـوفیانی كـوڕی عویەینـەدا دەڵێـت: (ئیبن عویەینە ئەم فەرمودەی لێ تێك چووە).[1]

گونجـاوە پەسـەندكردنی هەنـدێ ڕێوایـەتیان –نـەك لەبـەر ئـەوەی لای ئـەم چەسـپاوە– بـەڵكو هۆكـەی ڕاویەكەیـە، نـەك ئەوانـەی لێ یـان گێڕاوەتـەوە، یـان هەنـدێكیان بـەهێزترن لـە هەندێكی تریان.

مەبەست لە قسەكەی دارەقوطنی و خەڵكی تر لەسەر ڕاویەك لــە ڕاوییــەكانی كــە (لێ ی تێــك چــووە لــە فەرمودەكەیــدا) بەرپرسیاری یەتەكە دەخرێتە سـەر ڕاویەكـەو لێ تێـك چـونەكە لادەبات لەسەر ئەوانەی لێیان گێڕاوەتـەوە، ڕیوایەتـەكانی تـری ڕاوییەكـە دروسـتن ناكرێـت هەنـدێكیان پەسـەند بكـرێ بەسـەر هەندێكی تریان –با هەندێك ڕاوی بـەهێزتربن لـە هەنـدێكی تـر– مـادەم هـەموو ڕیوایەتـەكانی تـری ڕاسـتە كەواتـە: لاسـەنگی حیاوازییەكە لەسەر ئەمە نەك ئەوانی تر.

---

[1] العلل ١٠/٢٨٠.

## تاك بونەوەی سوهەیل بەم فەرمودەیە

ئیبن عەدی ئەم فەرمودەی لە باسی سوهەیل دا هێناوەو لە کتێبی (الکامل في الضعفاء)[1] لەو کتێبەیدا ئەو فەرمودە (منکر)[2]و (غریب)[3]انە دێنیّ کە کەسێك تەنها خۆی دەیگێڕێتەوە، لە سەرەتای کتێبەکەیدا مەرجی خۆی باس دەکاتو دەڵێت: (بۆ هەرکەسێك ئەو فەرمودە باس دەکەم کە دەیگێڕێتەوە بەهۆیەوە لاواز دەبێت، یان بەهۆی گێڕانەوەیەکەوە ناوی لاوازی دەخرێتە پاڵ)[4] ئیبن عەدیلە باسی ڕاویەکە تەنها ئەو فەرمودانە باس دەکات بەهۆیەوە لاواز دەبێت، یان بەهۆی گێڕانەوەکەی لاواز دەکرێتو پێویست نییە لە هەموو فەرمودەیەکدا بڵێت: (منکر) یان (ضعیف) لاواز بەم شێوەیە زانایانی دوای خۆی لیّ ی تێگەشتون.

ئیبن حەجەر دەڵێت: (لە عادەتی ئیبن عەدی یە هێنانی ئەو فەرمودە (منکر)انەی کەسی متمانەدار گێڕاویەتیەوە، دەشڵێت: پاش ئەوەی قسەی زانایان باس دەکات لەسەر عەکریمە،

---

[1] الکامل في الضعفاء ٣/٤٤٩ .

[2] المنکر: مارواه الضعیف مخالفًا للثقة.

[3] الغریب: ماتفرد بروایته راو واحد.

[4] الکامل في الضعفاء ١/٢.

دەڵێــت: هــیچ فەرمودەیــەکیم نــەهێناوە، چــونکە زانایــان بەکەسێکی ڕاستو دروسـتی دەزانـن، وە پێـشەوایانو خـاوەنی (صـحاح) فـەرمودەیان لێ گێڕاوەتـەوە، وە کەسـێکی دیـارەو پێویست ناکات هیچ فەرمودەیەکی بهێنم).[1]

زەرکەشـی لـە کتێبـی (النکـت)دا دەڵێـت: (ئـەبو ئەحمـەدی کـوڕی عـەدی سەرچـاوەیەکی بەسـودە لـە ناسـینی فـەرمودە (منکر)ەکان).[2]

ئیبن عـەدی چـەند فەرمودەیـەکی سـوهەیلی هێنـاوەو تـەنها قـسەی لەسـەر یـەك فـەرمودەیانی کـردوە کـە هەڵەیـە ئـەویش فەرمودەکەی (سـوهەیل)ە لـە بـاوکی لـە ئـەبو هـورەیرەوە کـە دەڵێت: (لا تسافر المرأة ثلاثة أيام إلا مع ذي محرم) واتە: ( هیچ ئافرەتێك سەفەرێکی سێ ڕۆژی نەکات لەگەڵ کەسێکی مەحرەم دا نەبێت).

ئیبن عەدی دەڵێت: (ئـەم فـەرمودەی (ئەبوصـالح) لـە ئـەبی سەعیدەوە) ئەم فەرمودەیـە لـە باشـترینیانە، لـە کاتێکدا ئـەم فەرمودانـەی لـە باسـی سـوهەیل دا هێناویـەتی قـسەی لەسـەر

---

[1] فتح الباری ١/٤٢٩.

[2] النكت على مقدمة إبن الصلاح ٢/١٥٧.

نەکردوون‌و لە هەڵبەستراوەکاندا دەژمێدرێن. چ جای (منکر)، بەڵکو تەنها باسی هەڵەکەی کردوە لە فەرمودەی (لا تسافر المرأة..)و لێ تێکچونەکەی تیادا دیاری کردوە، بەڵام فەرمودە (منکر)و (غریب)ەکانی سیقەو ڕاستگۆیی باسنەکردوە کە هەڵەو لێ تێکچونی تێدایە، بەڵکو ئەوانەی هێناوە کەسەکە بەتەنها خۆی دەیگێڕێتەوەو پێشەوایان ڕەخنەی لێ دەگرن، با کەسەکەش جێی متمانە بێت.

بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئیبن عەدی لە باسی سوهەیل لە باوکی لە ئەبو هورەیرەوە دەیگێڕێتەوە (من قتل وَزَغًا في اول ضربة كان له من الاجر...).

واتە: (هەرکەسێك قوم قومەیەك بە یەکەم لێدان بکوژێت پاداشتێکی بۆ هەیە...) قسەی لەسەر نەکردووە، پاشان ئەم فەرمودە دەهێنێت (فرخ الزنا لايدخل الجنة) واتە: منداڵی زینا ناچێتە بەهەشتەوە) دەڵێ: ئەمەیش بە سوهەیل ناسراوە. فەرمودەی یەکەم (من قتل وزعا...) لە صەحیحی موسلیم دایە.[1]

---

[1] ح رقم ٢٢٤٠.

زەهەبی دەڵێت: (لەسەر سورپێنەرەکانی سوهەیل لە باوکی لە ئــەبو هــورەیرەو (مــن قتــل وزعــاً في أول ضــربة...) واتــە: (هەرکەسێك قوم قومەیەك بەیەکەم لێدان بکوژێـت...) وە (فـرخ الزنا لا یدخل الجنة) واتە: (منداڵی زینا ناچێتە بەهەشتەوە).

ئـەوەش ئـەو تێگەشـتنەی ئـیبن طـاهـیری مەقدیـسی یـە لـە کتێبی (ذخـیرة الحفـاظ) کاتێـك دەڵێـت: فـەرمودەی (فـرخ الزنـا لایدخل الجنة)[1] واتە: (منداڵی زینا ناچێتە بەهەشتەوە) سوهەیل دەیگێڕێتــەوە لــە بــاوکی لــە ئــەبی هــورەیرەوە، ئەمــەیش بــە سوهەیل ناسراوە، وە یەکێکە لەوانەی ڕەدی دراوەتەوە).[2]

ئیبن جەوزیش لە هەڵبەستراوەکاندا باسی کردوە.[3]

فەرمودەی (لاتبدؤا المشركين بالسلام) واتە: (سەلام مەکـەن لە هاوبەش دانەران) ئیبن عەدی لە کتێبی (الكامل في الضعفاء)دا لەباسی سوهەیل هێناویەتیو جگە لە سوهەیل کەسێکی تر بـەم شێوەیە نەیگێڕاوەتەوە، وە کەسـیش نـە لـەباوکیو نـە لەئـەبی هـورەیرەوە نەیگێڕاوەتــەوەو (شــاهد)یـشی نیــە لەڕێگــە یــەکی تــرەوە، ئەمــەش (منکــر)ەو دەبێــت بــچەسپێت، بــە تایبــەت

---

[1] سير أعلام النبلاء ٥/٤٥٩.

[2] ذخيرة الحفاظ ٣/١٦٦٢.

[3] الموضوعات ٣/١١١.

پێچەوانەی دەەقـی لـە خـۆی بـەهێزتر دەکـات لـەڕوی سـەنەدو مانـاوە، پێویـست ناکـات هــەموو فەرمودەیــەکی (غریـب) یـان ئەوەی (نکارة)ی تێدایـە تەنانـەت ئەوانـەی ئـیبن عـەدی ش لـە (الکامل)دا هێناویەتی لاواز بێت، بەڵکودەکرێت (منکر)ی یەکەی لەسەر لابرێت بە گەڕانەوەی فەرمودەکە بۆ بنچینەیەك کـە ئـەو ناتەواوی یەی لەسەر لابەرێت.

چونکە (نکارة) زۆرجار دەوترێتو مەبەست پـێی (فـرد) تـاك بووە نەك فەرمودەکە وەربگێرێت یـان ڕەد بکرێتـەوە لەکنـەوی دەڵێت: (زۆرجار مەبەستیان لە (منکر) (فرد) تاکبووەیە).[1]

(نکارة) دەگونجێت لەکەسی سـیقەو (حـافظ)ەوە بێـت، بـەڵام ئەگـەر لەکەسـی نـزمترەوە بـوو زۆرجـار پێـشەوایان هەڵوێـستەی لەسەر دەکـەن، یـان ڕەدی دەکەنـەوە هـەتا (نکـارة)کـەی لەسـەر لادەچێت بە (متابعـە)ی فـەرمودەی تـر، وە ئەگـەر ڕەدکـرا ئـەوە (منکر)ە.

کەواتە (نکـارة) لـەخودی خۆیـدا ڕەد ناکرێتـەوە وەك نـەوەوی دەڵێت: (ئەوان (منکر) ئەدەن بەسەر فەرمودەی تاك بوی خـاوەن

[1] الرفع والتکمیل ص٢٠٠.

متمانەو سیقە، ئەمەیش (منکر)ێکی ڕەدکراوە نیە ئەگەر کەسـەکە خاوەن متمانەو سیقەو زیرەك وردبین بێت).[1]

ئیبن صەلاح دەڵێت: (بڕیاردان بەسـەر فـەرمودەی تـاك بـوو بەڕەدکردنەوەی یان (نکارە) یـان (شـاذ) لـە ووتـەی زۆرێـك لـە فەرمودەناسان دا بەدی دەکرێـت) وە عێراقـی لـە شـەرحەکەیدا دەڵێت (سەیری ئەو کەسە دەکرێت ئەگەر خاوەن (عدل و ضبط و إتقـان) عەدالـەتو لەبـەرکردنو وردبینـی بـوو تـاك بووەکـەی وەردەگرێت، وەك نمونەکانی پێشوو وە ئەگەر وانەبوو ئەوا ئـەو تـاك بونـەوەی لەکـەداری دەکـاتو بـێ هێـزی دەکـات، پاشـان لەچەند پلەیەکی جیاوازدا دەبینرێتەوە، ئەگەر کەسەکە نزیکبوو لەپلەی (عدل و ضبط و إتقان) عەدالەتو لەبەرکردنو ووردبینی ئەوا فەرمودەکەی بەباش دەزانرێتو نایخەینـە پـاڵ فـەرمودەی لاواز. وە ئەگـەر وانـەبوو وەری نـاگرینو بـە (شـاذ)و (مُنکـر) دادەنرێت).[2]

(نکارة) بە (متابعەو شاهد) لادەبرێت، هەروەك ئیبن ڕەجـەب دەڵێت: (النکارة والـشذوذ) لاناچـێت لـەلای یـەحیای قـەططـانو

---

[1] شرح النووي على صحيح مسلم ١\٥٧.

[2] التقييد والايضاح شرح مقدمة ابن الصلاح ١/١٠٤.

ئیمـامی ئەحمـەدو بـەردیحیو کەسـانی پێـشینە بـە (متابعـە) نەبێت.

پێناسەی (النكارة)ش دەکاتو دەڵێ (کەسم نـەدیوە پێناسـەی (النكارة والمنكر)ی وەك ئەبوبەکری بەردیجی حافظ–کە کەسـێکی هەڵکەوتووە لە (العلـل)دا– کردبێـت کـە دەڵێـت: (مُنكـر) ئەوەیـە کەسێك فەرمودەیەك لە هاوەڵان یان شوێنکەوتوان بگێڕێتەوە، کە ئەو فەرمودەیە نەناسرێتەوەو نەگێڕرابێتەوە تـەنها لای ئـەم تاکـە کەسەوە نەبێت) باسی ئەم وتەیەی لـە تـاك بـووەی (شـوعبە یـان سەعیدی کوڕی ئەبی عروبە، یان هیشامی دەستەوایی) دا کـردووە بـە فەرموودەیـەك لـە قـەتادە لـە ئەنـەس لـە پێغەمبـەر ﷺ وەك ئاشکرا کردنێك بـەوەی هـەر خـاوەن متمانەیـەك تـاك ببێتـەوە لـە گێڕانەوەکەیـدا لــە خـاوەن متمانەیـەکی تـر لەڕێگەیـەکی تـرەوە نەناسرێت ئەوە (منكر)ە هەروەك ئیمامی ئەحمەد لە فەرمودەکەی عبدالله کوڕی دینار لە عبـدالله کـوڕی عومـەرەوە لـە پێغەمبـەرﷺ گێڕوەتـەوە (النهـا عـن بیـع الـولاء[1] وعـن هبتـە) واتـە: (قەدەغـەی فرۆشتنو بەخـشینی (الـولاء)ی کـردووە) ووتویـەتی: ئـەم ووتەیـە

---

[1] کەسێك بەندەیەکی هەبێتو ئـازادی بکـاتو بێتـە مـیرات گـری، پـێی دەوترێـت (الولاء)و فرۆشتنو بەخشینی دروست نیە.

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (النكارە) لای یەحیای ططان لاناچێت بە ناسینەوەی فەرمودەکەوە نەبێت لە ڕێگایەکی ترەوە.

قسەکەی ئیمامی ئەحمەدیش لەمەوە نزیکە.

بەردیجی دوای ئەمە دەڵێت (فەرمودەکانی قەتادە زانایانی وەك حەمادی کوڕی سەلەمەو هەممامو ئەبانو ئەوزاعی دەڵێن: دەڕوانرێتە فەرمودەکە ئەگەر فەرمودەکە جگە لەڕێگەیەکی ئەمانەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێتو بناسرێت، یان لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لە ڕێگەیەکی ترەوە هاتبێت وەردەگیرێت، ئەگەر نا ئەوە (منكر)ە[1]، ووتەکەی ئیبن ڕەجەب کۆتایی هات.

گومانی تێدا نیە ئەم فەرمودەی سوهەیل (نكارە)ی تێدایەو دەبێت لەسەری بووەستین، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی وتەی پێشەوایانو بەبێ حیاوازیان (منكر)ە، بەلام ئەبی حاتمو بوخاری هەرکاری پێناکەن، بەڵکو بەلاوازی دەزانن، بەلام لای ئەوانەی متمانەی پێدەکەن، چونکە لەڕیزی (حُفاط)دا نیە ئەوە تاك بونەوەکەی وەرناگیرێت، لەبەر ئەوەی (متابعە)ی نەکراوە،

---

[1]شرح علل ابن رجب ٢٤٣/١.

کەواتە بۆلابردنی (منکر) لەسەری پێویستی بە (شـواهد) هەیـە، وە لەبەر ئەوەی بە گشتی (شواهد)ەکان پێچەوانەی دەکەن ئەوا پێویستە پێکەوە (جمع) کۆبکرێنەوە تا ماناکـەی ڕێـك بکرێـتو (نکــارە)کـــەی لێ لابـــدرێت لەلایەکـــەوە، لەلایـــەکی تـــرەوە ســـەنەدەکەی بـــەهێز بکرێـــت، چـــونکە ســـوهەیل وەك زانـــراوە لەبـــەرکردنی لاوازو خـــراپ بـــووەو فـــەرمودەی لەبیرچـــوەو لێـــی تێکچووە، ئەم ناتەواویەشی لەسەر لاناچێت هـەتا ڕیوایەتەکـەی هاوســەنگ نــەکرێت لەگــەڵ ئــەو ڕیوایەتانــەی تــردا کــە بــاسو شێوەی فەرمودەکەی دەردەخات.

ڕاگــرتنو تێڕامــانو ووردەکــاری لــە فــەرمودەدا نادروســتی فەرمودە ناگەیەنێت، وەك طاهیر جەزائیری دەڵێت: (نابینی کـە دەڵێن دوو فەرمودەی صەحیح ئەگـەر پێـچەوانەی یـەك بـوونو پێکەوە کۆنەکرانەوەو یـەکێکیان بەسـەر ئـەوی تـردا پەسـەندو قوبـول نـەدەکرا، ئـەوا هــەردوکیان ڕادەگــرین، ئــەم ڕاگــرتنو وەســتانو تــێ ڕامانــە لــە فەرمودەکــە نــاوی صــەحیحی لەســەر لانابات).[1]

---

[1]توجيه النظر إلى أصول الاثر ١/٥١٤.

هەروەها گێڕانەوەی ئیمامی موسلیم بۆ فەرمودەکە (نکارة)ی لێ لانابات، چونکە یاسای پلە بەرزکردنەوەی هەبوونی (متابع) یان شاهد)ە، هەروەك ئیبن حیببان لەسەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێت: (من نمونەیەك دێنمەوە تامەسەلەکەی پێ بزانرێت، وەك ئەوەی هاتبێت بۆلای حەممادی کوڕی سەلەمەو دەبینین فەرمودەیەك لە ئەیوب لە ئیبن سیرین لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ئەم فەرمودەیەشی جگە لە حەمماد لای کەسی تر لە هاوەڵانی ئەیوب نەبینراوە، ئەوەی پێویستە نابێت برینداری بکەین‌و دەبێت سود لە ڕیوایەتی هاوەڵانی وەربگرین، سەرەتا پێویستە سەیری ئەم فەرمودەیە بکەین، ئایا هاوەڵانی حەمماد، یان یەکێکیان لێیان گێڕاوەتەوە ئەگەر گێڕابێتیانەوە دەزانین ئەم فەرمودەیە حەمماد باسی کردوە با کەسەکەش لاوازبێت ئەوە دەخرێنە پاڵ یەکەوە، وە هەرکاتێك دەرکەوت ئەوەی لە ئەیوبی گێڕاوەتەوە (متابعە)ی پێ ناکرێ، ئەوا پێویستە بوەستین‌و (وهن) لاوازی نەکەین، بەڵکو سەیر دەکەین ئایا جگە لە ئەیوب کەسێکی خاوەن متمانە ئەم فەرمودەی لە ئیبن سیرین گێڕاوەتەوە؟

ئەگەر هەبوو ئەوا دەزانرێت ئەم فەرمودەیە بنچینەیەکی هەیە بۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەر نەبوو، ئەوکات سەیری دەکەین

ئایا جگە لە ئیبن سرین کەسێکی سیقە ئەم فەرموودەی لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە؟ ئەگەر هەبوو، ئەوا دەزانرێت فەرمودەکە بنچینەیەکی هەیە، ئەگەر نەبوو، سەیر دەکەین ئایا کەسێکی تر جگە ئەبو هورەیرە ئەم فەرمودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە؟

ئەگەر هەبوو دەردەکەوێت ئەم فەرموودە ڕاستەو بنچینەیەکی هەیە، وە ئەگەر نەبوو، ئەوا فەرمودەکە پێچەوانەی سێ بنچینەکەیەو دەزانرێت بێگومان هەڵبەستراوە). [1]

## پاساو لە گێڕانەوەی ئیمامی موسلیم بۆ فەرمودەکە

ئیمامی موسلیم گلەیی لەسەر نی یە لە گێڕانەوەی فەرمودەکەی سوهەیل، ئیمامی موسلیم لە سەرەتای کتێبەکەیدا ئەوەی ڕون کردوەتەوە کە لەسەرباسەکانیدا یەکەمجار فەرمودە پلە یەکەکان دێنێت کە خاوەنی لەبەرکردنو وردەکارینو (حفظ) و (إتقان) دەیکاتە بەڵگە، پاشان فەرمودە پلە دوەوکان دێنێت کە خاوەن عەدالەتو ڕاستگۆین (العدالة والصدق) دەیکات بە (شاهد)، وە ئەگەر جیاوازیان تێدابوو باسی دەکات، بۆ ئەوەی

---

[1] الإحسان بترتیب صحیح ابن حبان ١\١٥٥.

جیاوازیە زارەکی یەکەی ڕون بکاتەوە نەك بۆ ئـەوەی ئـیش بـە هەموویان بکات، یان هـەموو زاراوەکانیـان بـۆ ڕاسـت بکاتـەوە، سـوهەیل لـەم پلەدایـەو ئیمـامی موسـلیم لـە کۆتـایی باسـەکەدا فەرمودەکەی باس کردوە، پاش فەرمودەکەی ئەنەس‌و عائیشە لـە (وەڵامدانـەوەی خـاوەن کتێبـەکان) هـەروەك چـۆن باسـی جیاوازی ڕاویەکانی کردوە لەسەری.

ئیمامی حاکیم پاساوی بۆ ئیمـامی موسـلیم هێناوەتـەوە کـە زۆربەی فەرمودەکانی سوهەیلی لە (شـواهد)دا هێنـاوە نـەك لـە (أصل) بنچینەکاندا.

لەگەڵ ئەوەشدا بنچینەی ئەم فەرمودەیە جێگرو دروستە لـە فـــەرمودەی ئـــەبی بەصـــرەتی غیفـــاری، شـــاهیدی هەیـــە لـــە فەرمودەی عبدولرەحمانی جوهـەنی‌و عبـدالله ی کـوڕی عومـەر، هێنانی ئەم فەرمودەیەش زیان بـە ئیمـامی موسـلیم ناگەیـەنێت ئەگــەر لــە (متابعــةو شــواهد)دا گێڕابێتیــەوەو باســی جیــاوازی زاراوەکەی کردبێت.

ئیمـامی موسـلیم دەڵێـت: (پاشـان ئێمـە بەویـستی خـودا سەرەتاین لە گێڕانـەوەو نوسـینی ئـەوەی پرسـیارت لێ کـردوە، لەسەر مەرجێك پاشان بۆت باس دەکەم، ئێمە سەرەتا کۆمـەڵێ فەرمودە دەهێنین‌و دەیکەین بەسێ بەش‌و سێ پلەو چینەوە:

**پلەی یەکەم:**

ئێمە مەبەستمانە فەرمودە ڕاستو دروستەکان پێش بخەین بەسەر فەرمودەکانی تردا کە (راوی)گێرەوەکانیان وردبینو ڕاوەستاون لە فەرمودەدا، وە گێرراوەکانیشیان جیاوازیو هەڵەی نابەجێیان تێدا نیە، وەك چۆن لای زۆرێك لە فەرمودە ناسان بینراوەو دەرکەوتووە لە فەرمودەکاندا، ئەگەر ئێمەش لێکۆڵینەوەی فەرمودەکانی ئەم جۆرە کەسانەمان کرد، هەندێ کەس لە سەنەدی فەرمودەکانیاندا هەیە وەك جۆری یەکەم نین لە لەبەرکردنو ووردبینی (حفظ) و (إتقان)، ئەمانە با پلەیان لەوان نزمتربێت بە ڕاستگۆو زانا دادەنرێن، وەك (عەطاءی کوڕی سائیبو یەزیدی کوڕی ئەبی زیادو لەیسی کوڕی ئەبی سولەیم)و هاو ئاستەکانیان لە هەڵگرانو گێڕەرەوانی فەرمودە، ئەوان با بەوشێوەیەش بن کە باسمان کردن، بەڵام برادەرەکانیان کە خاوەن (إستقامەو إتقان) دامەزراوی وردبینن لەمان بەرزترن).[1]

ئەمە دەقی ووتەی ئیمامی (موسلیم)ە کە بۆ (الشواهد)ی فەرمودەی پلە دوەکانی هێناوە، ئەوانەی پێناسەی دەست پاکیو ڕاستگۆیی (الامانة والصدق) دەیانگرێتەوە با لەخاوەن

---

[1] مقدمة الصحيح ٢/١.

(حفظ وإتقان) زیرەکیو وردبینەکانیش نەبن بەهۆی کەمو کورِی لە فەرمودەکەیاندا دایبەزاندون بۆ پلـە دووەکـان، وەك (لەیـسی کورِی ئەبو سولەیمو عەطاءی کورِی سائیب). بێگومان سـوهەیل لەم چینەیە، وە ئەگەر ئیمامی موسلیم فـەرمودەی لێ گێڕایـەوە لە (الـشواهد) یـان فەرمودەیـەك خەوشـی تێـدابو، وە ڕیوایەتـە جیاوازەکانی باس کرد، ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئیمامی موسلیم کـە ئـەم هـەموو وتانـەی گێڕاویەتیـەوە هـەموی بـە صـەحیحو دروست زانیبێ.

لەوانە ڕیوایەتی (شورەیك)ی هێناوە لـەڕوداوی شـەو ڕەویو هەنـدێ وشـەی تێدایـە پێـچەوانەی ئەوەیـە کەسـانی (حُفـاظ) گێڕاویانەتەوە.

(سەنعانی) دەڵێت: (عبدولحـەق لـە کۆکردنـەوەی نێـوان دوو فـەرمودەی صـەحیح پـاش گێڕانەوەکـەی (شـورەیك) دەڵێـت: زیادەیەکی نەزانراوی زیاد کردوەو چـەند وشـەیەکی نەناسـراوی هێناوە، کۆمەڵێك لـە پێـشەوایانو (حُفـاظ) وەك ئـیبن شـیهابو سـابیتی بـەنانیو قـەتادە لـە ئەنەسـەوە، ئـەوەی (شـورەیك) هێناویـەتی ئـەمان نـەیان هێنـاوە، وە (شـورەیك) بـە (حُفـاظ) دانانرێت لای فەرمودەناسان، نکـوڵی ووتـەی (سـنگ لـەتکردنو شـۆرین)ی لێدەکـەن لـەو شـەوەدا، ئەگـەر ئەمـەت زانـی ئـەوا

دەزانیت ڕەخنە لە موسلیم ناگیرێت لە گێڕانەوەی فەرمودەکەی شورەیك، پاش ئەوەی کەمو زیادو پێش خستنو دواخستنەکەی ڕونکردۆتەوە[1]).

ئیبن صەلاح دەڵێت: (مەرجی موسلیم لە صەحیحەکەیدا ئەوەیە: فەرمووده دەبێت سەنەدەکەی لێکنەبچڕاو بێتو کەسانێکی سیقە دەیگێڕنەوەو لە کەسانێکی سیقە لە سەرەتای سەنەدەکەوە تا کۆتایی، خاڵی بێت لە شازیو لە نەخۆشی، ئەمە لە خودی خۆیدا پێناسەیە بۆ فەرمودەی صەحیح.

هەر فەرمودەیەك ئەم مەرجانەی تێدابێ ئەوە صەحیحە لای فەرمودەناسان، ئەو فەرمودانەی یەکدەنگ نین لەدروستی یەکەی دەگونجێت هۆی جیاوازییەکەیان بە مەرج گرتنی مەرجێك بێت لەو مەرجانە، وەك حاڵی یەکێك لە ڕاویەکان شاراوە بێت یان فەرمودەکە (مرسل)[2] بێت، یان هۆی جیاوازیەکەیان ئەوە بێت ئایا هەموو مەجەکانی صەحیحی تێدا کۆبوەتەوە؟ یان هەندێکیان؟ وەك جیاوازییان لە سیقەی ڕاوی فەرمودەیەك، یان ئەگەر هاتوو فەرمودەکە خاوەن متمانەکان گێڕابویانەوە، بۆ نمونە لە سەنەدەکەیدا ئەبو زوبەیری مەککی یان سوهەیل یان عەلائی

---

[1]توضیح الأفکار ١/١٢٣.

[2]المرسل: رواه التابعي عن النبیﷺ.

کوڕی عبدوڕەحمان یان حەممادی کوڕی سەلەمەی تێدابوو ئەوا دەڵێین: ئەم فەرمودەیە صەحیحە لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیم، بەڵام صەحیح نیە لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری.

فەرمودەیەکمان لە (موسلیم)ەوە گێڕاوەتەوە لەبەشی شێوازی نوێژکردنی پێغەمبەر ﷺکە دەڵێت: (هەموو ئەوانەی لای من صەحیحن لێرەدا نەمنوسیوەتەوە –مەبەستی ناو کتێبەکەیەتی– بەڵکو تەنها ئەوانەم داناوە زانایان یەك دەنگن لەسەری)، ئەمەیش ئاڵۆزە، چونکە چەندەها فەرمودەی هێناوە زانایان یەك دەنگ نین لەسەری، لەبەر ئەوەی لە فەرمودەی ئەو کەسانەن باسمان کردون یان باسمان نەکردونو زانایان جیاوازن لە ڕاستی فەرمودەکەیو یەك دەنگ نین لەسەری).[1]

کەواتە ئیمامی موسلیم ئەگەر فەرمودەیەکی گێڕایەوەو ڕیوایەتەکانو ووشەکانی باس کرد، ئەمە نابێتە ڕاستکردنەوەی ئەو بۆ هەموو وتەکانی ناو فەرمودەکە، بەڵکو لەناتەواو دەچێت بەپێی ڕونکردنەوەی جیاوازیەکانی ناو فەرمودەکە، ئەمەش ڕونو ئاشکرایە بۆ ئەوانەی کتێبەکەیان خوێندبێتەوە.

---

[1] صیانة صحیح مسلم ٧٢.

ئەبو مەسعودی دیمەشقی لەبارەی زیادەی سولەیمانی تەیمی لە کتێبەکەی موسلم دا دەڵێت: (وإذا قرأ فانصتوا) واتە: (ئەگەر قورئان خوێندرا ئەوا بێدەنگبن) (ئیمامی موسلیم لە گێڕانەوەی فەرمودەکەی (سولەیمان تەیمی) ویستویەتی جیاوازی فەرمودەکەی ڕون بکاتەوە بەپێی فەرمودەکەی (قەتادە)، نەك جێگیری بکات)[1]، یان ویستویەتی کەم و کورتیو جیاوازیەکەی ڕوون بکاتەوە بەپێیڕیوایەتەکەی (قەتادە) نەك جێگیری بکات.

ئیمامی موسلیم فەرمودەکەی سوهەیلی لە کۆتایی باسەکەدا باسکردوەو نەیکردووەتە سەرباس، بەڵکو فەرمودەکەی ئەنەسو عائیشەی کردوەتە سەرباس، پاشان ئەم فەرمودەی سوهەیلی هێناوەو ئاگاداری داوە لەسەر جیاوازی وشەکانیو ووتویەتی: (محمدی کوڕی موسەننا بۆی گێڕاینەوە محمدی کوڕی جەعفەر بۆی گێڕاینەوە شوعبە بۆی گێڕاینەوە (ح)[2](گواستنەوە). هەروەها زوهەیری کوڕی حەرب بۆی گێڕاینەوە جەریر بۆی گێڕاینەوە، هەمویان لە سوهەیلەوە بەم سەنەدە، وە لە فەرمودەی وەکیع (وأذا لقيتم اليهود) واتە: (هەرکاتێك گەشتن بە جولەکەکان) وە لە فەرمودەی جەریر (إذا لقيتموهم ولم يسم احدا من المشركين) واتە:

---

[1] انظر الإلزامات والتتبع للدارقطني تعليق المحقق ص ٢١٣.

[2] (ح) بمعنى: تحويل من السند الى سند آخر للحديث.

(هـــەركاتێك گەشـــتن پـێـیـــان، وە نـــاوی كەســـی نـــەهێناوە لـــە هاوەڵدانەران).

لەوانەیـــە ئیمـــامی موســـلیم جیاوازیـــەك نـــەبینێ لـــەنێوان فـــەرمودەی ســـوهەیل –بەگـــشتی– وە فـــەرمودەكانی تـــری باســـەكە،، وەك یـــبن عەبدولبـــەڕ ئاگـــاداری داوە لەســـەری كـــە ڕیوایەتەكەی سوهەیل وەك مانای فەرمودەكەی جوهـەنی وایـەو دەڵێت: (لە ئەبی عبدوڕەحمان جوهەنی یەوە دەڵێـت: گـوێم لـە پێغەمبــەر بــوو ﷺ دەیفــەرموو: (إنّــي راكــب غــداً إلى يهــود فــلا تبدؤوهم بالسلام، فإذا سلموا عليكم فقولوا وعلـيكم) واتــە: (مـن سبەی بەسواری دەچم بۆلای جولەكە، جا سەلامیان لێ مەكـەن، وە هەركاتێك سەلامیان لێ كردن بڵێن: لەسەر خۆتان).

كۆمــەڵێك لــە زانایــان لــە ســوهەیل لــە باوكیــەوە لــە ئــەبو هـــورەیرەوە لـــــە پێغەمبـــــەر ﷺ گێڕاویانەتـــــەوە وەك مانـــــای فەرمودەكەی ئەبی عبدوڕڕەحمان جوهەنی).[1]

فەرمودەكــەی (جوهــەنی) ڕون‌و ئاشــكرایە كــە لەبەســەرهاتی گەمارۆدانی بەنی قورەیزەدا بووە، ئیمامی موسـلیم فەرمودەكـەی سوهەیل یان هەندێك لە ڕیوایەتەكانی –وەك ڕیوایەتەكـەی وەكیـع

[1] الاستذكار ٨/٤٦٧.

لــه ســەوری لــه ســوهەیل– وەك فەرمودەكــەی جوهــەنیو ئــەبی بەسرەتی غیفاری دەبینێت، وە پێویستیش نیه موسلیم هاوڕابێـت لەگەڵ ئەو زانایانەی بە گشتیو بەربڵاوی ئیـشیان بـە فەرمودەكـە كردوە.

كەواتە ئیمامی موسلیم كاتێك فەرمودەیەك بـاس دەكـات لـە (الشواهد)دا ئاگـاداری دەدات لـە جیـاوازی لەفزەكـەی، ناكرێـت بچەسپێت بەسەریدا كە ئەو بە صەحیحی داناوە، بەڵكو بەگشتی فەرمودەكــە بەدروســت دەزانێــت لــەوەی وەك فــەرمودەكانی باسەكەیە نەك ئەو لەفزانەیشی پێچەوانەی فەرمودەكانە.

هــەروەها فەرمودەیــەك جیـاوازی لەســەر بێـت بـە گێڕانــەوەی موسلیم پلەكەی بەرز نابێتەوە، بـەڵكو وەك بابـەتێكی ئیجتیهـادی دەمێنێتەوەو سەیری قسەی هەموو لایەك دەكرێتو بەپێی بەڵگـە بڕیاری لەسەر دەدرێت، وە لەم بارەیەوە ئەبو حاتمو هاوڕاكانی لە ئیمـامی موسـلیم كـەمتر نـین، ئەگـەر دەربـارەی سـوهەیل ووتــی: (ئیشی پێ ناكرێتو بۆ بەڵگە ناشێت)و ئیمامی موسلیم بە بەڵگەی دانا، پێویستە قـسەكەی لەبەرچـاو بگیرێـت هـەتا بەڵگـە نێوانیـان یەكلا دەكاتەوە.

## بەشی دووەم

## دەقە پێچەوانەکانی فەرمودەکەی سوهەیل

فەرمودەکەی سوهەیل لەڕواڵەتدا پێچەوانەی ئەو فەرمودە ڕاستو دروستو رونانەیە کە داوای بڵاوکردنەوەی سەلام دەکەن لەوانە:

١- فەرمودەی بەڕاء لە بوخاریو موسلیمدا (أمرنا رسول اللهﷺبسبع... وإفشاءالسلام)[١] واتە: پێغەمبەر ﷺفەرمانی پێکردین بە حەوت شت.... وە بڵاوکردنەوەی سەلام کردن).

٢- فەرمودەی عبدالله کوڕی سەلام یەکەم شتێك پێغەمبەر ﷺلە یەکەم ڕۆژی چونە ناو مەدینەدا فەرمووی (ياأيها الناس أفشوا السلام وأطعموا الطعام وصلوا الارحام، وصلوا بالليل

---

[١] البخاری في صحيحه ح رقم ٥٨٨١ كتاب الأدب باب إفشاء السلام و مسلم في صحيحه ح رقم ٢٠٦٦.

والناس نيام، تدخلون الحنة بسلام)[1] واته: (ئەی خەڵكینە سەلام كردن بڵاوبكەنەوە، خواردن ببەخشنەوە، پەیوەندی خزمایەتی پەیوەست كەن، شەو نوێژ بكەن كاتێ خەڵكی نوستووە، بە ئارامیو بێخەم دەچنە بەهەشتەوە).

٣- فەرمودەی عبدالله ی كوڕی عومەر، پیاوێك لە پێغەمبەرﷺی پرسی لە ئیسلامدا چی خێرترە؟ فەرموی (تطعم الطعام، وتقرأ السلام على من عرفت ومن لم تعرف)[2] واتە: خواردن ببەخشە، وە سەلام بكە لەوەی دەیناسیتو لەوەی نایناسیت).

ئەم فەرمودە مەشهورو دروستانە هەمویان گشتی دەگەیەننو بەتەواوی لەگەڵ ئایەتەكانی قورئاندا یەكدەگرنەوە، وەك خودای گەورە لەبارەی هاوەڵبڕیاردەرانەوە دەفەرموێت(سَلامٌ عَلَيْكُمْ لا نَبْتَغِي الْجاهِلِينَ)[3] واتە: (لە ئێمەوە توشی زیان نابن، ئێمە نامانەوێت لەگەڵ نەفامەكاندا سەرگەرم بكەین) وە دەفەرموێت:

---

[1] الترمذي ح رقم ٢٤٨٥ وقال (حديث صحيح)، وابن ماجه ح رقم ٣٢٥١ واللفظ له، وصححه الحاكم ١٧٦/٤ح رقم ٧٢٧٧ .

[2] البخاري في صحيحه ح رقم ١٢، ومسلم ح رقم ٣٩.

[3] سورة القصص آية ٥٥ .

(فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ)[1] واتــه: (جـاتۆ وازیـان لێ بێنــهو بڵـێ: لهمنــهوه هــهر لــه ئاشـتیو بـێ زیـان بـۆ ئێـوه) ئـیبن جـهریری طهبهری دهڵێت: (سلام علـیكم) ووشــهی (سـلام) مـهرفوع بـووه بههۆی (علیكم) یان (لكم).[2]

فهرمودهكهی سوههیل هەموو ئهو دهقه گشتی یانـه تایبـهت دهكـات، وه ئــهو دهقانـه تایبـهت ناكرێـت بـه دهقێكـی ڕاسـتو دروسـتو ئاشـكراو ڕون نــهبێت، بگـره فهرمودهكـهی سـوههیل تـــهنها تایبـــهتیان ناكــات، بـــهڵكو حــوكمی ئـــهو ئایهتانـــهش ههڵدهوهشێنێتهوه، كه بهڵگهیه لهسهر دروستی سهلام كردن لـه هاوهڵدانــهران لــهكاتی نــهبونی شــهڕدا، لهكاتێكـدا فهرمودهكـه بهگشتی ئهم بڕیارهی لاداوهو سهلام كـردن قهدهغـه دهكـات لـه هاوهڵدانهرانو خاوهن كتێبهكان.

ئهم فهرموده بهڵگهی ئهوانهیه دهڵێن: سهلام كـردن دروسـت نیه دهڵێن: (نـسخ) ههڵوهشـاوهتهوه، جگـه لـهم فهرمودهیـهش بهڵگهی تریان نیه.

---

[1] سورة الزخرف آية ٨٩ .

[2] جامع البيان ٢٢٠/١١ تفسير أية ٨٩ من سورة الزخرف.

## تێڕوانینی پێشینان بۆدەقەکانی قورئان

کۆمەڵێك لە زانایانی (سلف) پێشین ئەم ئایەتە گشتیانەیان کردوەتە بەڵگە لەسەر دروستی سەلام کردن لە هاوەڵدانەران لەوانە:

١- شوعبەی کوڕی حەبحاب دەڵێت: لەگەڵ عەلی کوڕی عبداللە باریقی دا بووم جولەکەیەك یان گاورێك دای بەلامان داو ئەویش سەلامی لێ کرد! شوعبە دەڵێت، پێم ووت: ئەوە جولەکەیە یان گاورە؟ ئەویش کۆتایی سورەتی (الزخرف)ی بۆ خوێندمەوە (وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَؤُلَاءِ قَوْمٌ لَا يُؤْمِنُونَ (٨٨) فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ (٨٩))[١]. واتە: ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەمانە گەلێکن کە باوەڕ ناهێنن بەم قورئانە، جا تۆ وازیان لێ بێنەو بڵێ: لەمنەوە هەر لە ئاشتیو بێ زیانی بۆ ئێوە هەیەو، بەم زوانە دەزانن چیان کردوە).[٢]

٢- مەسعودی لە عەونی کوڕی عبداللە وە دەڵێت: محمدی کوڕی کەعب پرسیاری لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کرد دەربارەی سەلام کردن لە ئەهلی زیمە؟ ئەویش ووتی: وەڵامیان

---

[١]سورةالزخرف آية (٨٩،٨٨).

[٢]ابن أبي شيبة في المصنف ٢٥٩/٥ وإسناده صحيح.

دەدرێتەوەو سەلامیان لێ ناکرێ، ووتم چۆن وا دەڵێیت؟ ووتی: سەلام لێ کردنیان بە خراپ نازانم، ووتم: بۆچی؟ وتی: چونکە خودا فەرمویەتی: (فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ) [1] واتە: (جا تۆ وازیان لێ بێنەو بڵێ: لەمنەوە هەر لە ئاشتیو بێ زیانی بۆ ئێوە هەیەو، بەم زوانە دەزانن چیان کردووە) [2].

٣- ئیبن عویەینە دەڵێت: دروستە سەلام کردن لە (کافر) بێ باوەڕ،بەپێی ئەم ئایەتە (لَا يَنْهَاكُمُاللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ) [3] واتە: ( خودا ڕێگەی لەئێوە نەگرتووە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شەڕیان لەگەڵدا نەکردون) وە ئیبراهیم علیه السلام بە باوکی دەفەرموێت: (سلام علیك) [4] ، واتە: (سەلامت لێ بێ ، من هیچ خراپەیەك بەرامبەر تۆ ناکەم) [5].

---

[1] سورة الزخرف الاية٨٩.

[2] ابن أبي في المصنف ٢٤٩/٥ ورجاله رجال الصحيح إلا أن سماع يزيد بن هارون من المسعودي بعد اختلاطه غير أن يحي بن معين صحح حديثه عن عون وهذا منها كما في الكواكب النيرات رقم ٣٥ .

[3] سورة الممتحنة ٨.

[4] سورة مريم آيه ٤٧.

[5] انظر فتح الباري ٣٩/١١ .

## هاوەڵان و سەلام کردن لە نا موسڵمان

کۆمەڵێك لە هاوەڵان و پێشینان لەڕوانگەی دەقـەکانی قورئـان و فەرمودەکانـەو سـەلامیان کـردوە لـە ناموسـڵمان، یـان سـەلام لێ کردنیان بە دروست زانیوە لەوانە:

### ١- ئەبو ئومامەی باهیلی

ئیسماعیلی کوڕی عەییاش دەگێڕێتەوە لە محمدی کوڕی زییـاد هانی و شەرحەبیلی کوڕی موسلیم لە ئەبی ئومامەوە (ئەو نەیـداوە بـەلای موسـڵمانێك یـان جولەکەیـەك یـان گاورێـك ئـیلا سـەلامی لێ دەکـردن) لـە ئـەبو ئومامـە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ (أمرنـا رسـول اللهﷺ أن نفشي الـسلام)[1] واتـە: پێغەمبـەری خـوادا ﷺ فـەرمانی پێ دەکردین سەلام کردن بڵاوبکەینەوە) لەڕیوایەتێکی تردا (أمرنـا رســول اللهﷺ أن نفــشي الــسلام)[2] واتــە: (پێغەمبــەری خــوا ﷺفەرمانی پێ کردین سەلامکردن بڵاوبکەینەوە).

---

[1] ابن أبي شيبة في المصنف ٢٤٩/٥ و٢٤٧/٥ ، وعنه ابـن ماجـه في الـسنن ح رقـم ٣٦٩٣ وقـال البوصـيري :إسـناده صـحيح رجالـه ثقـات.وهـذا إسـناد صـحيح فإنـه مـن روايـة إسماعيل بن عياش عن أهل بلده وثقات شيوخه كمحمد بـن زيـاد وشـرحبيل بـن مـسلم صحيحة يحتج بها، كما في تهذيب التهذيب ٢٨٢/١ .

[2] الطبراني في المعجم الكبير ١١١/٨ ، وفي مسند الشاميين ح رقـم ٨٢١ بأسـانيد صـحيحة إلى إسماعيل وبقية حدثني محمد بن زياد، وقد صرح بقية بالسماع فزال مـا يخـشى مـن تدليسه.

لـە ڕیوایـەتێك دا لــە محمـدی کـوڕی زیـادەوە دەڵێـت: مـن دەسـتی ئـەبی ئومامــەم دەگـرتو لەگەڵیـدا دەچـومەوە بـۆ ماڵەکەی، ئەبو ئومامە نەیئـەدا نـە بـەلای موسـڵمانێك، نەبـەلای گاورێـك، نەبـەلای بـچوکێك، نەبـەلای گەورەیەکـدا ئـیلا دەیـوت (سـلام علـیکم! سـلام علـیکم! سـلام علـیکم) کاتێـك دەگەشـتە بەردەرگای ماڵەکەی ڕوی تێدەکردینو پاشان دەیوت: برازاکـانم (أمرنا نبينا أن نفشي السلام)[1]

واتە: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکـردوین سـەلام کـردن بـڵاو بکەینەوە) وەك محمدی کوڕی زیـادی هـانی لـە ئـەبی ئومامـەی باهیلی، ئەو بەهەرکەسێك بگەشـتایە سـەلامی لێـدەکرد، دەڵـێ: نـازانم کـەس لــە سـەلام کردنـدا پێـشی کـەوتبێت جولەکەیـەك نەبێت، لەپشت پایەیەکدا خـۆی شـاردبویەوەو هـاتوو سـەلامی لێکرد، ئەبو ئومامە پـێی وت: ئەی جـو چـی وای لێ کـردی ئـاوا بکەیت؟ ووتـی: دەبینم تۆ زۆر سەلام دەکـەیتو بـۆم دەرکـەوت ئەوە چاکەیەو منیش حەزم کرد وابکەم، ئەبو ئومامە ووتـی: من

[1] البيهقي في شعب الإيمـان ٦/٤٢٥ ، وحليـة الأوليـاء ٦/١١٢ بأسـانيد صـحيحة إلى بقية وقد صرح بالسماع فزال ما يخشى من تدليسه.

گوێم له پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو (إن الله جعل السلام تحية لامتنا وأمانة لأهل ذمتنا)[1]

واتە: (خودا سەلام کردنی داناوە بۆ ئومەتەکەمانو ئەمنو ئەمان بۆ ئەهلی زیمەکانمان) ڕاستیەکەی ئەم ووتەیە وەستاوە لە سەر ئەبو ئومامەو (مرفوع) نیەو نەگەشتووە بە پێغەمبەر ﷺ.

---

[1] الطبراني في المعجم الكبير ١٠٩/٨، والأوسط ح رقم ٣٢١٠ وقال (تفرد به عمرو)، ومسند الشاميين ح رقم ٨١٧ عن بكر بن سهل الدمياطي عن عمرو بن هاشم البيروتي عن إدريس بن زياد به، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد ٦٣/٨ و٦٩ (رواه الطبراني في الأوسط وفيه من لم أعرفه وعمرو بن هاشم البيروتي وثق وفيه ضعف)وقال أيضا(رواه الطبراني عن شيخه بكر بن سهل الدمياطي ضعفه النسائي وقال غيره مقارب الحديث)، ورواه أيضا البيهقي في شعب الإيمان ٤٣٦/٦، وقال ابن عدي في الكامل رقم ٧٤٠ عن عمرو بن هاشم البيروتي(عمرو ليس به بأس ولم أر للمتقدمين فيه كلام وقد تكلموا فيمن هو أمثل منه بكثير)، قلت والصحيح أنه لا يثبت مرفوعا قوله (تحية لأهل ملتنا وأمانا لأهل ذمتنا)، والصواب وقفه على أبي أمامة قوله، فقد ذكره ابن عبد البر فقال (روى الوليد بن مسلم عن عروة بن رويم قال رأيت أبا أمامة يسلم على كل من لقي من مسلم وذمي ويقول هي تحية لأهل ملتنا وأمان لأهل ذمتنا واسم من أسماء الله نفشيه بيننا) وهذا أصح إسنادا.

## ٢- عبدالله كوڕی مەسعود

ئەعمەش لە ئیبراهیم لە عەلقەمەوە، دەڵێت: (لەگەڵ عبدالله ی كوڕی مەسعود دەهاتم دوو سەرۆك هۆزی خەڵكی (حیرە) بونە هاوڕێی كاتێك چونە ناو كوفە، لە ڕێگەكە لایانداو ڕێگەیەكی تریان گرتەبەرئەویش ڕوی تێ كردن‌و بینینی ڕێك بونەتەوە سەلامی لێ كردن، ووتم: ئایا سەلام لەم بێ باوەڕانە دەكەیت؟ ووتی: بەڵێ، ئەوان هاوڕێ یەتیان كردم‌و هاوڕێ یەتی مافی هەیە).[1]

لە شوعبە لە موغەیرەو سولەیمانی ئەعمەش لە ئیبراهیم لە عەلقەمەوە: ئەو لە پاشكۆی عبدالله ی كوڕی مەسعود دابو لەسەر گوێدرێژێك لەڕێگەدا خەڵكێك لە سەرۆك هۆزەكان بونە هاوڕێیان، كاتێك گەشتنە سەرپردێك، بەڕێگەیەكی تردا ڕۆشتن! عبدالله ی كوڕی مەسعود ئاوڕی دایەوەو كەسیانی نەبینی، ووتی: هاوڕێ یانمان لەكوێن؟ عەلقەمە ووتی: بەڕێگەیەكی تردا ڕۆشتن! عبدالله وتی: (علیكم السلام) واتە:(سەلامتان لێ بێت)! عەلقەمە وتی: ئەمە مەكروه نیە؟ ووتی: (ئەمە مافی هاوڕێیەتیە).[2]

---

[1] ابن أبي شيبة في المصنف ٢٥٩/٥ .وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

[2] البيهقي في شعب الإيمان ٤٦٣/٦ أثر رقم ٨٩٠٩ ، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

له مەسعودی له قاسمی کوڕی عبدوڕڕەحمان له تەمیمی کوڕی سەلەمەوە دەڵێت:(هەندێ کەسی (مشرك) هاوەڵدانەر لەگەڵ عبدالله دا ڕێیان دەکرد کاتێك گەشتنە دەرگای کۆشکەکە سەلامی لێ کردن)[1].

## ٣- ئەبو دەرداءوفوزالەی کوڕی عوبەید

له ئیسماعیلی کوڕی عەییاش له ئیبن عەجلان دەڵێت عبدالله و ئەبو دەرداءو فەزالەی کوڕی عوبەید سەلامیان له هاوەڵادانەران دەکرد).[2]

## ٤- عەمماری کوڕی یاسیر

لەصیلەی کوڕی زوفەر له عەمماری کوڕی یاسیر دەڵێت:(سێ شت له هەرکەسێکدا هەبن شیرینی باوەڕ دەچێژێت، بەخشین لەکاتی نەداریدا، دادوەری با لەسەر خۆیشت بێت، سەلام کردن).[1]

---

[1] الطبراني في المعجم الكبير ١٩٣/٩ ، قال الهيثمي في مجمع الزوائد ٨٣/٨ (رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح إلا أن تميم بن سلمة لم يدرك ابن مسعود)، وقد صح عن ابن مسعود من طرق أخرى.

[2] ابن أبي شيبة المصنف ٢٤٩/٥، عن إسماعيل بن عياش، وهذا الأثر من رواية ابن عياش عن ابن عجلان المدني، وفيها ضعف، وتتقوى بشواهدها.

## ٥- ئیبن عەباس

لە عەمماری دوهـەنی، لـە پیاوێـك لـە كورەیـب دەگێڕنـەوە ئـیبن عەباس: لە نامەیەكی دا بۆ پیاوێكی ئەهلی كیتابی نوسیبوو: (السلام علیك).[2]

## ٦- خەڵكی شام

لە شوعبە لە سوهەیلەوە دەڵێت لەگەڵ باوكم دا ڕۆشتم بۆ شـام، ئـەوان كاتێـك تێدەپـەڕین بـەلای پەرسـتگەیەكداو گـاوری تێدابوایـە سـەلامیان لێ دەكـردن! بـاوكم ووتـی: سـەلامیان لێ مەكـەن، ئـەبو هورەیرە بۆی گێڕامەوە لە پێغەمبـەرەوە ﷺ فـەرمووی (لاتبـدؤوهم بالـسلام وإذا لقیتمـوهم في الطریـق فاضـطروهم الى أضـیق الطریـق)[3] واتە: (سەلامیان لێ مەكەن، وە هەركاتێك پێ یان گەشتن لەڕێگەكەدا ڕێگەكەیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێ یان بكەن) وە لەڕیوایەتێكی تردا (لاتبـدؤوهم بالـسلام وأضـطروهم إلى أضـیقه)[4] واتـە: (سـەلامیان لێ مەكەنو ڕێیان لێ تەسك بكەنەوەو لاڕێیان كەن).

---

[1] عبد الرزاق في المصنف ٣٨٦/١٠ عن معمر عن أبي إسحاق السبيعي عـن صـلة بـه، وابـن أبـي شيبة في المصنف ١٧٢/٦ عن وكيع عن الثوري عن أبي إسحاق به وإسناده صحيح، وانظر فـتح الباري ٨٢/١ ح رقم ٢٨ حيث أورده البخاري معلقا عن عمار .

[2] ابن أبي شيبة المصنف ٢٤٨/٥ عن وكيع عن الثوري عـن الـدهني بـه، ورجـال إسـناده رجال الصحيح إلا أنه فيه راو مبهم.

[3] أبو داود في السنن ح رقم ٥٢٠٥ .

[4] أحمد في المسند ٣٤٦/٢ ح ٨٥٤٢ .

## سەلام كردن لە ئەهلی كیتاب

## ڕێبازی (تابعی) شونێكەوتوانی خەڵكی (شام)ە.

ئەم ریوایەتانە ئەوە دەسەلمێنێت كە سەلام كردن لە ئـەهلی كیتاب ڕێبازێكی دیارو بڵاو بووە لەناو (تابعي) شـوێن كـەوتوانی خەڵكی شامو لای ئـەبو ئومامـەو ئـەبو ئەلـدەرداءو ئەوانـەی لـە شام ژیاون.

ئیبن عبدولبەڕ هەوڵی داوە ئـەم سـەلام كردنـەیان بـە جـائیز دابنێ نـەك سـونەت، وە فـەرمودەی (لاتبـدؤوا الیهـود بالـسلام) واتە: (سەلام مەكەن لـە جولەكـەكان)ی تـەئویل كـردوە لەسـەر مانای (لایجب علیكم ان تبدؤوا الیهود بالسلام) واتە: (لەسەرتان پێویست نیە دەستپێشخەربن لە سـەلام كـردن لـە جولەكـەكان) كـاتێ دەڵـێ: (لــە كۆمــەڵێك لــە هــاوەڵانو شــوێنكەوتوانەوە گێڕاوەتەوە، ئەوان گەشتبن بە هەركەسێك موسڵمان یان ئـەهلی زیمە سەلامیان لێ كردون، واتە: واجب نیە لەسـەر موسـڵمانێكی پیــادە ســەلام بكــات لــە دانیــشتویەكی زیمــی، وە ســوارێكی موسڵمان لە پیادەیەكی زیمـی، وەك چـۆن بـە فـەرمودە واجبـە سەلام كردن لە موسڵمان، وە ئەگەر سەلامی كرد قـەیناكا، وەك بڵـێی! پێغەمبــەر ﷺ فەرمویــەتی: (لـیس علـیكم أن تبـدؤوهم بالسلام)واتە: (پێویستن نیە لەسەرتان سەلامیان لێ بكـەن)، بـە

بەڵگەی ئەوەی وەلیدی کوڕی موسلیم گێڕاویەتیەوە لە عورووەی کوڕی ڕووەیم کە دەڵێت: (ئەبو ئومامەی باهیلی م بینی بەهەرکەس بگەیشتایە سەلامی لێ دەکرد موسڵمان بێت یان زیمی وە دەیوت: (سەلامکردن سەلامە بۆ ئێمەو ئەمنو ئەمانە بۆ زیمی یەکانمان، ناوێکیش لەناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەو بڵاوی دەکەینەوە)، مەحاڵیشە ئەبو ئومامە پێچەوانەی سونەت بجولێتەوە ئەگەر لەوەدا ڕاست بێت، بەومانای تەئویلمان کردوە خودا زاناترە، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆیان (لَا يَنْهَاكُمُاللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ)[1] واتە: (خودا ڕێگەی لەئێوە نەگرتووە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شەڕیان لەگەڵدا نەکردون) قسەکەی ئیبن عبدولبەڕ کۆتایی هات.[2]

وەك دەبینین ڕاشکاوانە تەئویلی فەرمودەکەی سوهەیل دەکات بەوەی واجب نیە سەلام کردن لە ناموسڵمان، بەڵکو جائیزە نەك بەوەی قەدەغە بێت سەلام کردن لە غەیری موسڵمان، بەڵکو تەئویلی دەکات کە واجب نیە لەسەر موسڵمان سەلامیان لێ بکات بەڵکو جائیزە ئەمەیش خۆلادانە، لەکاتێکدا

---

[1] سورة الممتحنة آية ٨.

[2] بهجة المجالس ص ١٦٠ .

بەڕونی دەردەکەوێت کە ئەبو ئومامە سـەلامی لێ دەکـردن‌و بـە باشیـشی دەزانـی، بـەپێی ئـەم فەرمودەیـە: (أمرنـا بأفـشاء الـسلام) واتــە: (فــەرمانمان پــێ کــراوە ســەلام کــردن بــڵاو بکەینەوە)، وە ئەگەر ئیبن عبدولبەڕ هەمان بۆچـونی ئیـسحاقی کـوڕی ڕاهــوەیهی هەبوایـە لـە تـەئویل کردنـی فەرمودەکـەی سوهەیل کە دەڵێ: مەبەست ئەمن‌و ئەمان پێ نەدانیانە لـەکاتی جەنگ دا، ئەوکات سەلام کردنی ئەو هاوەڵانەی لێ ئاڵۆز نـەدەبو کە سەلامیان لێ کردون لەکاتی ئارامی‌و ئاسایش دا.

## ئەو فەرمودە گشتی یانەی باسی سەلام کردن دەکەن

هەنـدێك لـەو فـەرمودە گـشتیانە باسـی سـەلام دەکـات وەك فەرمودەی (أمرنا بسبع...) واتە: (فەرمانمان پێکراوە بە حەوت شت) کۆمەڵـە یاسـایەکیان تێدایـەو زانایـان کاریـان پـێ کـردوە مەگەر بەڵگەیەك مانا گشتگیری یەکەی قەدەغە کردبێت. لەوانە: (یاأیها الناس أفـشو الـسلام، وأطعمـوا الطعـام وصـلوا الأرحـام) واتــە: (ئــەی خەڵکینــە ســەلام کــردن بڵاوبکەنــەو، وە خــواردن ببەخشن، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنن).

زانراوە کە پەیوەندی خزمایەتی واجبـە، تەنانـەت لەگـەڵ نـا موسـڵمانیش دا وەك دایـك‌و بـاوك ئەگــەر موسـڵمان نــەبوون،

هـــەروەها خـــواردن بەخـــشین کـــەس نـــەیوتوە تایبەتـــە بـــە موسـڵمانەکانەوە، بـەڵکو کـارێکی چـاکەیەو گـشتی یـەو هـەموو کەسێك دەگرێتەوە.

بەیهـەقی دەڵـێ: (لـە کتێبـی (الـسنن)دا باسـی ڕوخـسەتی بەخـــشینمان کـــردوە بـــە خزمـــان، وە ســـەردانی کردنـــی نەخۆشەکانیان، بەئومێدی موسڵمان بونیان، هاوکاری کردنیانو کفنو دفن کردنی ئەوانەیان دەمرن).[1]

ئیمامی قورطوبی دەڵێت: (ئوممەت یەك دەنگە کە پەیوەندی خزمایەتی واجبەو بچڕاندنی حەرامە. کاتێك (ئـەسما) پرسـیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئایا سەردانی دایکم بکەم)؟ فەرموی (بەڵێ سەردانی بکە) فەرمانی پێکرد سەردانی دایکی بکـاتو کـافریش بوو).[2]

هەروەها فەرمودەی (أمرنا بسبع) واتـە: (فەرمانمان پـێ کـرا بە حەوت شت) لەوانە: (وەڵام دانەوەی پژمین، پشتگیری ستەم لێ کـراو، بڵاوکردنـەوەی سـەلام، بەدەمـەوە چـونی دەعـوەت،

---

[1] شعب الإيمان ٧/٤٤ .

[2] الجامع لأحكام القرآن ٥/٦ .

شوێن کەوتنی جەنازە) وە لە ڕیوایەتێکی تردا (وەڵام دانەوەی سەلام).

ئەم فەرمودەیە گشتی یەو دەقەکانی تر هاتووە تەئکید دەکاتەوە لەمافی موسڵمان بەسەر برا موسڵمانەکەی، دەقە گشتی یەکان وەك خۆیان دەمێننەوە هەتا بەڵگەیەکی پێچەوانەی دێت، بەڵام سەلام کردن ڕونەو کۆمەڵێك لە هاوەڵان کردویانە وەك باسکرا. لەژێر ڕۆشنایی ئایەتو فەرمودە گشتییەکاندا، هەروەها پشتگیری ستەم لێ کراو موسڵمان بێت یان ناموسڵمان، وەڵام دانەوەی پژمین.

پێغەمبەرﷺ وەلامی پژمینی جولەکەی داوەتەوەو فەرمویەتی (یهدیکم الله ویصلح بالکم) واتە: (خودا هیدایەتیان بداتو حاڵتان چاك بکات) وە وەڵام دانەوەی دەعوەتیش دروستەو جولەکەیەك پێغەمبەرﷺدەعوەت کردوەو ئەویش چووە بۆ دەعوەتەکەی.

ئیبن عبدولبەڕ دەڵێت: (بەڕاء ووتی: پێغەمبەرﷺفەرمانی پێ کردوین بە حەوت شت: لەوانە چون بەدەم دەعوەتەوە، وە

هەندێ شتی لێ باسکردوە، کە هەندێکیان فەرزی کیفایەیەو هەندێکیان سونەتە، لەوانەیش چون بەدەم دەعوەتەوە).[1]

شەبیهی مەغریبی دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردوین بە حەوت شت، واتە: فەرمانی واجب یان سونەت، بە (چون بۆلای نەخۆش) کە سونەتە با نەخۆشەکەیش زیمی بێت).

(شوێن کەوتنی جەنازە) کە سونەتە، ئەگەر کەس نەبو کفنو دفنی بکات دەبێتە فەرزی کیفایە، وەڵام دانەوەی پژمیو سونەتی کیفایەیە، بە مەرجێك (الحمد لله) بکات، (جێبەجێ کردنی سوێند)، (سەرخستنی ستەم لێ کراو) واجبە لەسەر کەسێك توانای هەبێت با ستەم لێ کراوە کەش زیمی بێت.[2]

ئیبن عەلانی شافعی دەڵێت: ( فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردین بە حەوت شتو قەدەغەی کردین لە حەوت، فەرمانی پێ کردین بە (سەردانی نەخۆش) واتە: فەرمانی سوننەت لە هەموو کاتێکدا کاتێك نەبێت ببێتە بارگرانیو بێتاقەتی نەخۆشەکە، (شوێن کەوتنی تەرم) واتە: کفنو دفن کردنی، (وەڵام دانەوەی بژمین) ئەگەر (الحمدالله)ی

---

[1] التمهيد ٢٧٥/١.

[2] الفجر الساطع على الصحيح الجامع ٨٧/٧ .

کرد، ئەم سێ فەرمانە بۆ سوننەتە، (جێبەجێ کردنی سوێن) وەك: سوێندم دای بەوە، یان سوێن بێت ئەوە دەکەیت، سوننەتە بیکات ئەگەر ناشەرعی نەبوو، وە (سەرخستنی ستەم لێ کراو) بەواجب با ستەم لێ کراوەکەیش زیمی بێت، واجبە لەسەر کەسێك توانای هەبێت بەکردار یان بەوتە، ئەمەیش دەگەڕێتەوە بۆ (فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە) ئەمەیش دەبێتە واجبی عەینی یان واجبی کیفایی).[1]

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیبن دەقیقی عید دەڵێت: ئەگەر سەیری وتەی زمانەوانەکان بکەین ئەوانەی دەڵێن وەڵام دانەوەی بژمیو دوعای خێر بۆکردنە ئەوە کافریش دەگرێتەوە، خۆ ئەگەر سەیری ووتەی ئەوانەی تر بکەین کە دەڵێن: وەڵام دانەوەیەتی بە (ڕەحمەت) واتە: (خودا ڕەحمت پێ بکات) ئەوە تایبەتە بە موسڵمان، ئیبن حەجەر دەڵێت: (ئەمە لەڕوی زمانەوانیەوە، بەڵام لەڕوی شەرعەوە فەرمودەکەی (ئەبو موسا) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان دەچنە ناو فەرمانە گشتی یەکەی وەڵام دانەوەی بژمیو، بەڵام وەڵام دانەوەیەکی تایبەت کە دوعا بۆکردنیانە بە هیدایەتو چاك بونیان، ئەمە قەدەغە نیە، بە

---

[1]دلیل الفالحین لطرق ریاض الصالحین ٢/٢٩٧ .

پێچەوانەی وەڵام دانـەوەی بـژمیوی موسـڵمان کـە دوعایـان بـۆ دەکرێت بە ڕەحمەت بە پێچەوانەی بیٚ باوەڕان).[1]

بەڵام شوێن کەوتنی جەنازە پێغەمبەرﷺ فەرمانی کردوە بە (علی) باوکی ئەسپەردە بکات کاتیٚ مرد.

عویـەینی دەڵێـت: (زانایانمـان ئـەم فـەرمودەیان بـە بەڵگـە هێناوەتەوە کە پێویستە لەسەر موسـڵمان ئەگـەر خزمێکـی بـیٚ بـاوەڕی مـرد بیـشۆرێتو کفـنو دفنـی بکـات، خـاوەنی کتێبـی (الهدایة) دەڵێـت: ئەگـەر بـیٚ باوەڕێـك مـردو سەرپەرشـتیارێکی موسڵمانی هەبوو دەیشواتو کفنو دفنی دەکـات، بـەم شـێوەیە فەرمان کراوە بە علی لە حەقی ئەبو طالیب ی باوکی).[2]

ئەوانەی ڕاڤەی فەرمودەکەیان کردووە لە زانایانی کۆنو تازە دەڵێن: هەندیٚ لـە فەرمانـەکانی ئـەم فەرمودانـە بـۆ موسـڵمانو ناموسڵمانەو ئەمەشیان لاڕون بووە.

لەکۆی قسەکانیان ئەوە دەردەکەوێت: فەرمودەکـە گشتی یـە لە بڵاوکردنـەوەی سـەلامو سەرخـستنی سـتەم لیٚ کـراوو سـەردانی نەخۆشو وەڵام دانەوەی پـژمین، هەندێکیـشیان بـۆ سـونەتە وەك

---

[1] فتح الباري ١٠/٦٠٤.

[2] شرح سنن أبي داود ٦/١٦٩.

بڵاوكردنەوەی سەلامو بەخشینی نانو وەڵام دانەوەی دەعوەتو شوێن كەوتنی تەرم بە مەبەستی كفنو دفن كردنی، وە دەشبێتە واجب ئەگەر كەسی تر نەبو ئەوكارە بكات تەنها ئەو نەبێت.

هەروەها جێبەجێ كردنی سوێند، كە مەبەست بە گەورە زانینی سوێندەكەیەو گشتی دەگەیەنێت، وەك ئیبن جەوزی دەڵێت: (جێبەجێ كردنی سوێند بۆ دوو مانایە، یەكەمیان بۆ بەگەورە گرتنی سوێند پێ خوراوە، دووەم: بۆ ئەو كەسەیە سوێندەكەی نەشكێت).[1]

عویەینی دەڵێت: (شێوەی پێنجەم لە جێبەجێ كردنی سوێندەكە تایبەتە بە حەڵاڵەوەو جێ بەجێ كردنی لەڕەوشتە بەرزەكانە، خۆ ئەگەر لە نەكردنیدا قازانجێك هەبوو ئەوا جێبەجێ ناكرێ).[2] زانراوو ڕونە ڕەوشتی بەرز لەگەڵ موسڵمانو ناموسڵماندا ئەنجام دەدرێت، وەك لەم فەرمودەدا هاتووە (إنما بعثت لأتمم صالح أو مكارم الاخلاق)[3] واتە: (بەڕاستی من هاتووم ڕەوشتە چاك یان بەرزو جوانەكان تەواو بكەم).

---

[1] كشف المشكل من حديث الصحيحين ١/٤٥٤.

[2] عمدة القاري ١٢/١٤٣.

[3] أحمد ٢/٣٨١ ،والحاكم ٢/٦٧٠ وقال (صحيح على شرط مسلم) كلاهما بلفظ (صالح الأخلاق)،والبيهقي ١٠/١٩١،بلفظ (مكارم الأخلاق).

# بەشی سێهەم

## شێوەی فەرمودەکەی سوهەیل و ڕونکردنەوە و ئاشکراکردنی کەمو کورتییەکانی

هەموو ئەو هەوالآنەی لەم هاوەڵانەوە: (ئیبن مەسعودو ئەبو ئومامەو فەزالەی کوڕی عوبەیدو ئەبو دەرداء) هاتووە بەڵگەن کە ئەمان وا تێگەشتون ئەو دەقانەی قورئانو فەرموودەکان بۆ گشتی یەو، هیچ شتێك تایبەتی نەکردووە، نەوەوی‌و ئیبن حەجەر لە (فتح الباري) داو ئیبن عبدولبەڕو کەسانی تر، هیچ بەڵگەیەکیان باس نەکردوە تایبەتی بکات، جگە لە فەرمودەکەی سوهەیل نەبێ لە باوکی یەوە!

فەرمودەکەی سوهەیل سێ کەمو کورتی تێدایە:

یەکەم: سوهەیل لەبەرکردنی خراپ بووە توشی لەبیر چونەوە بووە، وەك ئیمامی بخاری وتویەتی‌و لەبەر ئەوەیش

نەیکردوەتە بەڵگە لە کتێبەکەیدا، ئەبوحاتەمو یەحیای کوڕی مەعین بەبەڵگەیان نەزانیوە.

دووەم: تەنها سوهەیل ڕیوایەتی کردوەو کەسی تر نە لەباوکیو نەلە ئەبو هورەیرەوە نەیگێڕاوەتەوە، ئیبن عەدی لە (ألكامل)دا فەرمودەکەی باس کردوەو دەڵێت: (کەس بەم شێوەیە نەیگێڕاوەتەوە (وأضطروهم الى أضيق الطريق) واتە: (ڕێگەکەیان لێ تەسك بکەنەوە لاڕێ یان کەن)).

سێیەم: ڕیوایەتەکەی سوهەیل تێك چونی تێدایە، جارێك دەڵێ (المشركين)و جارێك (أهل الكتاب) جاریك (اليهود)، کەواتە: پێویستە جێگیر بکرێت: ئایا سوهەیل لەباوکی یەو لەئەبو هورەیرەوە بە (إذا لقيتم اليهود فلا تبدؤوهم بالسلام) واتە: (هەرکاتێك بەو جولەکانە گەشتن ئەوا سەلامیان لێ مەکەن) بیستویەتی؟ یان بە (إذا لقيتم أهل الكتاب)؟ واتە: (هەرکاتێك گەشتن بە ئەهلی کیتاب) بیستویەتی؟ یان بە (لاتبدؤوهم بالسلام) واتە: (دەستپێشخەر مەبن لە سەلام لێکردنیان) بیستویەتیو کەسی تێدا دیاری نەکراوەو مەبەست خەڵکێکی ئەو سەردەمە بووە؟ ئایا سوهەیل بەمانا گێڕاویەتیەوەو ئیجتیهادی تێدا کردوە؟ یان قیاسی جولەکەی کردوەتە سەر ئەهلی کیتاب؟ یان قیاسی موشریکەکانی کردوەتە سەر ئەهلی کیتاب؟ یان

ئیجتیهادی باوکی بووەو قیاسی گاورەکانی پەرستگەی شامی کردوەتە سەر جولەکەکانی بەنی قورەیزە ئەوکاتەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد سەلامیان لێ بکەن، بەبێ جیاوازی لەنێوان شەڕکەران و ئەوانی تریان؟ هەمو ئەو لەفزە جیاوازانەی هاتووە لە فەرمودەکەدا فەرمودەی سەربەخۆ نین تا پێکەوە کۆبکرێنەوەو بوترێ (المشركين) بەگشتی دەمێنێتەوەو وە باسکردنی ئەندامانی (اليهود)و (أهل الكتاب) تایبەت ناگەیەنێت... هتد

بێگومان هەمویان یەك فەرمودەیەو یەك کەس گێڕاویەتیەوەو لەبەرکردنی قسەی لەسەرە، زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە بۆی و ناکرێت هەمویان هەڵەبن، کەواتە ڕاستتر بوترێت سوهەیل سەرچاوەی ئەم جیاوازیانەیەو لێ ی تێکچوەو هەر جارێك بەشێوەیەك گێڕاویەتیەوە.

ئەوەیش ئەم ڕاستی یە دەردەخات ئیمامی موسلیم و ئیمامی ئەحمەدو کەسانی تر جیاوازی ڕیوایەتەکەیان باس کردوە، هەندێکیان دەڵێن (اليهود)وە هەندێك (أهل الكتاب) وە هەندێك (المشركين) دەڵێن.

بەڵکو ئەوانەی لە هاوەڵانی سوهەیل یان گێڕاوەتەوە بەدواداچونیان بۆ کردوە، ئایا سوهەیل ووتویەتی (المشركين)؟

یان (أهـل الكتـاب)؟ وەك هـاوەڵانی زوهـەیری كـوڕی موعاویـەو جـەریری كـوڕی عەبدولحەمیـد بۆیـان دەركـەوتووە جیـاوازی هەریەك لەم لەفزانەو ئەو حوكمەكە لەسەری دا دادەمەزرێت!

ئـەو پرسـیارەی لێـرەدا دروسـت دەبێـت، ئایـا ئـەم ووشـانە جیاوازییـان هەیـە؟ ئایـا جیاوازییەكـە كاریگـەریی دەبێـت لەسـەر حوكمەكـە؟ ئایـا گرفتـی لێ دەكەوێتـەوە ؟ بێگومـان جیاوازییـان هەیەو كاریگەریی دەبێت لەسەر حوكمەكەی، ووشەی (المـشركین) گشتی ترینیانـە، جگـە لـە موسـڵمان هـەموو كەسـێك دەگرێتـەوە، (أهل الكتاب) تایبـەتترە لـە (المـشركین)و گـشتیترە لـە (الیهـود)و گاورو جولەكەو صابیئە لەسەر قسەی ئەوانەی دەڵێن ئەوان ئەهلی كیتابن دەگرێتەوە وە (الیهود) تایبەت ترە لـە هـەر سـێ ووشـەكە تەنها جولەكە دەگرێتەوە، كەواتە جیاوازیەكەی نێوانیان جیـاوازی جـۆری نییـە بـەڵكو جیـاوازی لێـك جیاییـە، وەك جیـاوازی نێـوان گشتیو تایبەت.

ئەگەر ئەمانە ڕاست دەرچـون، ئـەوا حوكمەكـەی جیـاوازە، ئەگــەر (الیهــود) ڕاســتبوو، ئــەوا حوكمەكــەی تایبەتــە بــە جولەكـەوەو بـە قیـاس ئـەوانی تـری دەخرێتـە پـاڵ، دەكـرێ ئەمەیش ڕەدبكرێتەوە، چونكە دەقە گشتی یەكانی سەلام كردن وەك خــۆی دەمێنێتــەوەو تــەنها ســەلام كــردن لــە جولەكــە

ناگرێتـــەوە، چـــونکە ئـــەوان زۆر ئـــازاری پێغەمبـــەر ﷺو موسڵمانانیان داوەو نابێت سەلامیان لێ بکرێت.

ئەگەر ووشەی (المـشركين) پەسـەند بـوو ئـەوا دروسـت نیـە سەلام کردن جگە لە موسڵمانان، با دینەکانیشیان جیاواز بێت.

وە قسەی ئەبی صالّحی باوکی سوهەیل بۆ بەڵگە ناشێت کاتێك دەڕوات بە لای پەرستگەیەکداو دەڵێت: سەلامیان لێ مەکەن.

چونکە دەکرێ ئیجتیهادی خۆی بـوبێ، گـرنگ ڕیوایەتەکەیـە نەك بۆچـونەکەی، ڕیوایەتەکـەیش تـەنها کوڕەکـەی خـۆی لێ ی گێڕاوەتـــەوەو لێ ی تێکـــچووە، بـــە بەڵگـــەی ئەوانـــەی لێ یـــان گێڕاوەتـــەوە، وەك جـــەریری کـــوڕی عبدولحەمیـــد دەڵێـــت: (بـــۆ گاورەکانە لە وەصـف دا، ئێمـە بـۆ هـاوەڵ دانـەرانی دەبیـنین) کاتێـك علـی کـوڕی جەعـد پرسـیاری کـرد لـە زوهـەیری کـوڕی موعاویە: (ئایا جولەکەو گاورە؟ ووتـی: هاوەڵدانەرانە).

## فەرمودەکەی سوهەیل لای هاوەڵەکانی

کۆمـــەڵێك لـــە هـــاوەڵان فەرموودەکـــەیان بەشـــێوەیەکی تـــر گێڕاوەتـــەوەو لێ تێکـــچونەکەی ســـوهەیل ڕون دەکاتـــەوە، وە دەگونجێـــت ســـوهەیل کـــورتی کردبێتـــەوەو مانـــای کردبێـــتو ووردەکاری تێدا نەکردبێت، یان لەبیری کردبێت لەوانە:

## ١- ئەبو عەبدوڕڕەحمانی جوهەنی

محمـدی کـوڕی ئیحـسان لەیەزیـدی کـوڕی ئـەبی حـەبیب لەمەرسـەدی کـوڕی عبـدالله یـەزنی لـە ئـەبی عەبـدوڕڕەحمان جوهەنی، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی (إني راكب غدًا الى اليهود فلا تبدؤوهم بالسلام، وإذا سلموا عليكم فقولوا وعليكم).[١]

---

[١] ابن أبي شيبة في المصنف ٢٥٠/٥، وعنه ابن ماجه في السنن ح رقم ٣٦٩٩ ، عن ابن نمير عن ابن إسحاق به، وأحمد في المسند ١٤٣/٤ عن ابن أبي عـدي و٢٣٣/٤ عـن يزيـد بـن هـارون وابـن أبـي عـدي عـن ابـن إسـحاق حـدثني يزيـد بـه، قـال أحمد:خالفه عبد الحميد بن جعفر وابن لهيعة قـالا عـن أبـي بـصرة.قـال ثنـا أبـو عاصم عن عبدالحميد بن جعفر قال أبو بصرة !

وأبو يعلى في مسنده ح رقم ٩٣٦ عن أبي خيثمة عن ابن نمير بـه وفيـه قـال أبـو عبد الرحمن الجهـني(سمعـت رسـول الله صـلى الله عليـه وسـلم يقـول إنـي راكـب غداإلى يهود)، والطبراني مسند الشاميين ح رقم ٧٤٣ من طرق عن عبد الرحيم بن سليمان وابن نمير وعلي بن مسهر ويونس بن بكير وشريك بـن عبـد الله كلـهم عـن ابـن إسـحاق بـه، والطحـاوي في شـرح معـاني الآثـار ٣٤١/٤ ح ٦٧٣٧ و٦٧٣٨ وإسناده حسن عن عبد الأعلى وعبد الرحيم بن سليمان عن ابن إسحاق به.

قال البوصيري في زوائد ابن ماجه (في إسناده ابن إسحاق وهو مدلس.وليس لأبـي عبد الرحمن هذا سوى هذا الحديث عند المصنف ، وليس له شيء في بقية الكتـب الستة)، وتعقبه الألباني في إرواء الغليل ١١١/٥ بقوله (قد صرح ـ أي ابـن إسـحاق ـ بالتحديث عند الإمام أحمد في إحدى روايتيـه عنـه فزالـت شـبهة تدليـسه وإنمـا

واتە: (من سبەی بەسواری دەچم بۆ لای ئەو جولەکانە، ئێوە سەلامیان لێ مەکەن، هەرکاتێك سەلامیان لێ کردن ئەوا بلێن: لەسەر خۆتان)

## ٢- ئەبو بەسرەتی غیفاری:

محمدی کوڕی ئیسحاق گێڕاویەتیەوە لە یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب لە ئەبی بەسرەت غیفاری دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەربوو ﷺ دەیفەرموو: (إني راكب غدًا إلى يهود فلا تبدؤوهم بالسلام، فإذا سلموا عليكم فقولوا وعليكم)[١] واتە: (من سبەی بەسواری دەچم بۆ لای جولەکە، ئێوە سەلامیان لێ مەکەن، هەرکاتێك سەلامیان لێ کردن ئەوا بلێن: لەسەر خۆتان).

---

علته الاختلاف عليه ومخالفته لغيره) وقد رجح الحافظ في الفتح ٤٤/١١ أن المحفوظ رواية من رواه من حديث أبي بصرة الغفاري لا الجهني.

قلت: ولا يبعد أن يكون ابن إسحاق قد سمعه من ابن أبي حبيب على الوجهين من حديث الجهني ومن حديث الغفاري كما صح عنه، فقد كان ابن إسحاق واسع الرواية، وهو أعلم الناس بالمغازي والسير وهذا الحديث منها ـ وانظر ترجمته في تهذيب التهذيب ٣٤/٩ ـ ولهذا رجح أبو داود كلا الوجهين فقد قال بعد حديث أنس في الباب ح رقم ٥٢٠٧(وكذلك رواية عائشة وأبي عبد الرحمن الجهني وأبي بصرة الغفاري).

فالحديث إسناده حسن إلى الجهني، رجاله رجال الشيخين إلا ابن إسحاق فمن رجال مسلم.

[١] البخاري في الأدب المفرد ح رقم ١١٠١ و ح رقم ١١٠٢ ، وصححه الألباني، وأخرجه الطبراني في المعجم الكبير ح رقم ٢١٦٢ ولفظه (إني منطلق غدا إلى يهود).

ئـيبن لەهيعـە دەڵێـت: یەزیـدی کـوڕی ئـەبی حـەبیب بـۆی گێڕامەوە کە ئەبی خەیر –مەرسـەدی یـەزنی– دەڵـێ: گـوێم لـە (ئەبو بەسرەت) بوو ووتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إنا غـادون الى يهود فلا تبدؤوهم بالسلام فإذا سلموا عليكم فقولوا وعليكم).[1]

واتـە: (ئێمـە زوو دەردەچـین بـۆ لای جولەکـەکان، ئـەوا سـەلامیان لێ مەکـەن، جـا هـەرکاتێك سـەلامیان لێ کـردن بڵـێن لەسەر خۆتان).

لەڕیوایـەتێکی ئـەبی بەسـرەتدا دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ (أنا ذاهبون غدًا الى اليهـود، فـإذا لقيتمـوهم فـسلموا عليكم فَقولوا وعليكم)[2] واتـە: (ئێمـە سـبەی دەچـین بـۆلای ئـەو جولەکانە، جا هەرکاتێك پـێ یـان گەشـتن‌و سـەلامیان لێ کـردن ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان) ئێمەش پێ یان گەشتین‌و سەلامیان لێ کردین‌و پێمان ووتن: لەسەر خۆتان).

عبەدولحەمیدی کوڕی جەعفەر دەیگێڕێتەوە لە یەزیـدی کـوڕی حەبیب لـە ئـەبی بەسـرەت دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی (إنـا

---

[1] أحمد في المسند ٣٩٨/٦، وفي إسناده ابن لهيعة وقد توبع، والحديث صحيح.

[2] الطحاوي في شرح معاني الآثـار ٣٤١/٤ ح ٦٧٤٠ و٦٧٤١ مـن طريـق عبـد الله بـن وهب، والطبراني في المعجم الكبير ح رقم ٢١٦٤ من طريق أسد بـن موسـى، وابـن لهيعة صحح له الأئمة أحاديث العبادلة عنه ومنهم ابن وهب.

غادون على يهود فلا تبدؤوهم بالسلام، فإذا سلموا عليكم فقولوا وعليكم)[1] واتە: (ئێمە زوو دەچینە سەر جولەکە، ئێوە سەلامیان لێ مەکەن، جاهەرکاتێك سەلامیان لێ کردن، ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان).

لەڕیوایەتێکی عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەر لە یەزیدی کوڕی حەبیب لە مەرسەدی کوڕی عبدالله ی یەزنی لە ئەبی بەسرەتی غیفاری دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون (إنی راكب الى يهود، فمن أنطلق معي منكم فلا تبدؤوهم بالسلام، فإن سلموا عليكم فقولوا وعليكم)[2] واتە: ( من بەسواری دەچم بۆ لای جولەکە جا هەرکەسێك لە ئێوە لەگەڵ مندا دەرچوو با سەلامیان لێ نەکەن، خۆ ئەگەر سەلامیان لێ کردن بڵێن: لەسەر خۆتان).

فەرمودەکە صەحیحەو جیاوازی ناوی هاوەڵەکە زیانی لێ نادات، غیفاری یان جوهەنی بێت، ئەگەر لە هەردوکیانەوە هەمووی نەچەسپابێت، ئەوا محمدی کوڕی ئیسحاق لە یەزیدی کوڕی حەبیبەوە هەردو شێوەکەی گێڕاوەتەوە.

---

[1] أحمد في المسند ٣٩٨/٦، عن وكيع به وإسناده حسن، والحديث صحيح.

[2] الطحاوي في شرح معاني الآثار ٣٤١/٤ ح ٦٧٤١ ، والطبراني في المعجم الكبير ح رقم ٢١٦٢، والبيهقي في شعب الإيمان ح رقم ٨٩٠٤ ، بإسناد صحيح إلي عبد الحميد بن جعفر به.

## ٣- عبدالله ی کوڕی عومەر

بەیهەقی دەڵێت: سوفیانی سەوری گێڕایەوە لە (عبدالله ی کوڕی دینار) لە (عبدالله ی کوڕی عومەر) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (إنكم لاقون اليهود غدا، فلا تبدؤوهم بالسلام، فإن سلموا عليكم فقولوا وعليكم) واتە: (ئێوە سبەی دەگەن بە ئەو جولەکانە، جا سەلامیان لێ مەکەن، ئەگەر سەلامیان لێ کردن ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان).

بەیهەقی دەڵێت: بوخاری‌و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە (سوفیان)[1] ەوە ئەصڵی فەرمودەکە لە بوخاری دایەو موسلیم بەکورت کراوەیی دەیگێڕێتەوە لە فەرمودەی م(الیکی کوڕی دینار) لە (عبدالله ی کوڕی عومەر) بەم شێوەیە هاتووە: (إذا سلم عليكم اليهود، فإن يقول أحدهم السام عليك فقل وعليك)[2].

---

[1] البيهقي في السنن الكبرى ٢٠٣/٩ أخبرنا أبو طاهر الفقيه أنبأ أبو بكر محمد بن الحسين القطان ثنا أحمد بن يوسف السلمي ثنا محمد بن يوسف الفريابي قال ذكر سفيان، قال الألباني في إرواء الغليل ١١١/٥(بإسناد صحيح على شرط الشيخين وقد عزاه إليهما البيهقي عقبه ويعني أصل الحديث كعادته وإلا فليس عندهما (فلا تبدؤوهم بالسلام).

[2] الجامع الصحيح ح رقم ٥٩٠٢ .

واتـــه: (جـا هــەركاتێك ئـەو جولەكانــە ســەلاميان لێ كــردن، بێگومان يەكێكيان دەڵێت بمريت، جا بڵێ: خۆت).

هــەروەها (بوخــارى) لــە فــەرمودەى (ســوفيانو ماليــك) بــەم شێوەيە دەيگێڕێتــەوە پێغەمبــەر ﷺ فــەرموى: (إن اليهـود إذا سلموا على أحدكم أنما يقولون سام عليك فقل عليك).[1]

واتە: (بێگومان ئەو جولەكانە ئەگەر سەلاميان لـە يـەكێكتان كرد، ئەوە بێگومان دەڵێن: بمريت جا بڵێ: خۆت).

موسليم لە فەرمودەى ئيسماعيل ى كوڕى جەعفـەر لـە ئـيبن دينار بەم شێوەيە گێڕاويەتيەوە، پێغەمبەر ﷺفەرمويەتى: (إن اليهود إذا سلموا عليكم يقول أحدهم السام علـيكم، فقـل عليـك)[2] واتە: (بێگومـان ئـەو جولەكانـە هـەركاتێك سـەلاميان لێ كـردن، يەكێكيان دەڵێت: بمرن، جا بڵێ: خۆت) لە سوفيان بـەم شـێوە (فقولوا وعليك) واتە: (جا بڵێن: خۆت).

ئيبن ئەبى شەيبە دەڵێت: وەكيع بۆى گێڕاينەوە لە سوفيانى سەورى لە عبدالله ى كوڕى دينار لە عبدالله كوڕى عومەر دەڵێت:

---

[1] الجامع الصحيح ح رقم ٦٥٢٩.

[2] صحيح مسلم ح رقم ٢١٦٤.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إن اليهود إذا لقوكم وقالوا السام علـيكم قولوا لهم وعليكم).[1]

واتە: (بێگومان ئـەو جولەکانـە هـەر کاتێـك گەشـتن پێتـانو وتيان: بمرن، ئەوا پێيان بڵێن: خۆتان).

ئيمـامی ئەحمـەد دەڵێـت: سـوفيانی کـوڕی عويەينـە بـۆی گێڕاينەوە، بيستبوی لە ئيبن دينار لە عبدالله ی کوڕی عومەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمووی: (إذا سلم عليـك اليهـود فإنمـا يقـول السام عليك فقل وعليك) واتە: (هەرکاتێك ئەو جولەکە سەلامی لێ کردی ئەوە بێگومان دەڵێت: بمريت، جا تۆيش بڵێ: لەخۆشت). جـارێکيش فـەرمووی: (إذا سـلم علـيكم اليهـود فقولـوا وعلـيكم، فإنهم يقولون السام عليكم).[2]

واتە: (هەرکاتێك ئەو جولەکانە سەلاميان لێ کردن ئـەوا بڵـێن لەخۆتان، بێگومان ئەوان دەڵێن: بمرن).

هەروەها ئيمامی ئەحمەد دەڵێت: وەکيع بـۆی گێڕاينـەوە لـە سوفيانو عەبدوڕڕەحمان لە سوفيانی کوڕی عويەينە لـە عبـدالله ی کوڕی دينار لە عبـدالله کـوڕی عومـەر دەڵێـت: پێغەمبـەر ﷺ

---

[1] المصنف ٥/٢٥٠ ، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

[2] المسند ٢/٩ ، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

فــەرمووی: (إن اليهــود إذا لقــوكم قــالوا الــسام علــيكم فقولــوا وعليكم).[1]

واتــە: (بێگومــان هــەر كاتێــك ئــەو جولەكانــە گەشــتن پێتــان دەڵێن: بمرن، جا بڵێن: خۆتان).

لەفزەی كە ئـيبن ئـەبی شـەيبە ڕونو ئاشـكرايە كـە حـوكمی ووتنی (فقولوا لهم وعلـيكم) واتـە: (جـا پـێ يـان بڵـێن: خۆتـان) وابەسـتەيە بـەهۆی ووتنـی ئـەوان: (إن اليهـود إذا لقـوكم وقـالوا السام عليكم) واتە: (بێگومـان ئـەو جولەكانـە هـەركاتێ گەشـتن پێتانو ووتيان: بمرن).

دەگونجێت ئەو ڕيوايەتانەی فەرمودەكەی ئيبن عومەر كورت كرابێتـــەوەو عبـــدالله ی كـــوڕی دينـــار كـــورتی كردبێتـــەوە، ڕيوايەتەكەی سـەوری ڕونـی كردبێتـەوە كـە بەدرێـژی بەيهـەقی هێناويەتی (إنكم لاقون اليهود غدًا، فـلا تبـدؤوهم بالـسلام، فـإن سلموا عليكم قفولوا وعليكم).

واتە: (بێگومـان ئێـوە سـبەی دەگـەن بـەو جولەكانـە، ئـەوا ســەلاميان لێ مەكەن،ئەگــەر ئــەوان ســەلاميان لێ كــردن بڵــێن: لەخۆتان).

---

[1] المسند ٥٨/٢ ، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

دەگونجێت عبدالله ی کوڕی دینار هەردوو فەرمودەکەی بەدرێژی گێڕابێتەوە لە عبدالله ی کوری عومەرەوە، وەك سەوری گێڕاویەتیەوە لەبەسەرهاتی بەنی قورەیزە،وە بەکورتی گێڕابێتیەوە لەبەسەرهاتی ئەو جولەکەیەی ووتی: بمرن، لە فەرمودەکەی عائیشەو جابیرو ئەنەس ڕون دەبێتەوە.

وە فەرمودەکەی ئەبی بەسرەتی غیفاری پاڵپشتی ڕیوایەتە درێژەکە دەکات کە دەفەرموێ (إنـي راكب غداً الى يهود فلا تبدؤوهم بالسلام، فإذا سلموا عليكم فقولوا وعليكم).

واتە: (بێگومان من سبەی بە سواری دەچم بۆلای جولەکە، جا سەلامیان لێ مەکەن وە کاتێك سەلامیان لێ کردن بڵێن: لەخۆتان) لە ڕیوایەتی جوهەنی (إنـى راكب غداً الى اليهود...) واتە: (بێگومان من سبەی بەسواری دەچم بۆلای ئەو جولەکانە...) ئەمەیش ئەو بەسەرهاتەیە ئەم فەرمودەی تێدا هاتووە –هەندێ لە ڕاویەکان کورتیان کردوەتەوە– کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەرچو بۆ گەمارۆدانی ئەو جولەکانە، دور نیە سوهەیلیش کورتی کردبێتەوەو ماناکەی تێك دابێ.

ئیبن عەبدولبەڕ ئاگاداری داوە کە ڕیوایەتەکەی سوهەیل وەك مانــای فەرمودەکــەی جوهــەنی وایــە، دەڵێــت[1]: (لــە ئــەبی عەبـدرڕەحمان جوهـەنی ووتــی: پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: (إنــي راكـب غـدًا إلى يهـود فـلا تبـدءوهم بالـسلام، فـإذا سـلموا فقولـوا وعليكم).

واتــە: (مــن سـبەی بـە سـواری دەچـم بـۆلای جولەکـە، جـا ســەلامیان لێ مەکەن،هــەر کاتێــك ســەلامیان لێ کــردن بڵــێن: لەخۆتان).

وە کۆمەڵێك گێڕاویانەتەوە لە سوهەیلیو کوڕی ئـەبی صـاڵح لە باوکیەوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوەﷺ وەك مانای فەرمودەکەی عەبدوڕڕەحمان جوهەنی).

## دەرچونی پێغەمبەر ﷺ بۆ گەمارۆدانی بەنی قورەیزە

هــەموو ئــەم فــەرمودە صــەحیحانەی هــاوەڵان هــەمویان لەڕوداوی دەرچونی پێغەمبـەرﷺبـۆ گـەمارۆدانی جولەکـەکانی بــەنی قــورەیزەدا هــاتوە، پــاش خیانــەتکردنیان لــە غــەزای خەندەقدا، کە فەرمانی کردوە بە هاوەڵان سەلامیان لێ نەکـەن، وە ڕێگــەیان لێ تەسـك بکەنــەوەو لاڕێ یـان کـەن، چـونکە بـۆ

---

[1] الاستذكار ٨/٤٦٧ .

غەزايان هاتبون، سەلام لێ کردنيـانو وەڵام دانـەوەی سـەلاميان مانای ئاشتیو ئەمنو ئەمانە.

ئەم فەرمودانە ڕون کردنەوەيـە بـۆ فـەرمودە گـشتگيرەکەی ئەبو هورەيرە کە ئەو ئەوکاتە بەشـداری ڕوداوەکـەی نـەکردوەو دوای دو ساڵ لەڕوداوەکە لەساڵی حەوتـەمی کۆچـيدا موسـڵمان بووە. لەکاتێکدا گەمارۆی بەنی قورەيزە پاش غـەزای خەنـدەق بووە لەساڵی پێنجەمی کۆچيدا.

ئـــەم فەرمودەيـــە گـــشتگير نيـــەو هاوەڵدانـــەرانو خـــاوەن کتێبەکان ناگرێتەوە، بەڵکو هـەموو جولەکەيـەکيش ناگرێتـەوە، بەڵکو بۆکاتی جەنگەو لەگەڵ خەڵکی جەنگيدايە، خەڵکی زيمیو هاوپەيمانو خەڵکی (مشرك) هاوەڵدانـەری بێـوەيیو شـەڕنەکەر ناگرێتەوە.

ئيـسحاقی کـوڕی ڕاهەوەيـە مانـای ئـەم فـەرمودەی کـردووە بەوەی مەبەستەکەی پێنەدانی ئاشتیو ئـەمنو ئەمانـە بـۆ ئـەو جولەکانـە، کاتێـك دەرچـو بـۆ گـەمارۆدانيان، چـونکە ئـەوان جەنگيان بەرپاکردبوو دەڵێت: (ئەگەر پێويستی کرد بۆت هەيـە سـەلامی لێ بکـەيت وە مانـای فـەرمودەی (لاتبـدؤوهم بالـسلام)

واتــە: (ســەلامیان لێ مەکــەن) نــەوەك لــە ســەلام کردنەکــەدا وا تێبگەن ئاشتیو ئەمنو ئەمانەو شەڕیان لەگەڵ دا ناکەن).[1]

هەروەها شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە هۆی هاتنی فەرمودەی سەلام نەکردن لە جولەکە ڕون دەکاتەوەو وەك ئیبن قــەیم لێ ی گواستوەتەوە دەڵێت: (فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ(لاتبـدؤوهم بالسلام) واتە: (سەلامیان لێ مەکەن) چـونکە ئـەو دەرچـوبو بـۆ غەزای جولەکەی بەنی قورەیزەو فەرمانی پێکردن ســەلامیان لێ نەکەن، چونکە سەلام لێ کردنیان دەبێتە ئاشتیو ئەمنو ئـەمان بۆیان، لەکاتێکدا ئەو بۆ غـەزایان چـوبو گـوێم لـە شـەیخەکەمان بوو وای دەوت).[2]

ئـیبن قــەییم دەڵێــت: (لاتبــدؤوهم بالــسلام) ووتــراوە ئەمــە لەڕوداوێکی تایبەتدایە کاتێك ڕۆشتن بۆ بەنی قورەیزە، ئایە ئەم بڕیارە گشتی یە بۆ هەموو ئەهلی زیمــە؟ یـان تایبەتــە بەوانــەی حاڵیان وەك حاڵی ئەوانە؟ ئەمە جێی تێڕامانــە، بــەڵام ئیمـامی موســـلیم دەیگێڕێتـــەوە لـــە فـــەرمودەی ئـــەبی هـــورەیرە لـــە

---

[1] مسائل الإمام أحمد وإسحاق بن راهويه ٨٧/١ .

[2] أحكام أهل الذمة ١٣٢٦/٣ .

پێغەمبــەرەوە ﷺ (لاتبــدؤوهم اليهــود النــصارى بالــسلام، وإذا لقيتم أحدهم في الطريق فاضطروهم إلى أضيقه).

واتــە: (ســەلام لــەو جولەكــەو گاورەكــان مەكــەن، وە هــەركاتێك لەڕێگەیەكــدا گەشــتن بــە یــەكێكیان، ئــەوا ڕێگەكــەیان لێ تەســك بكەنەوەو لاڕێیان كەن)، ئەمە بڕیارێكی گشتی یە، زانایانی ســەلەفــو خەلەف بۆچــونیان جیــاوازە تیایــدا، زۆربــەیان دەڵــێن: ســەلامیان لێ مەكــەن، وە ئــەوانی تــر دەلــێن: دروســتە ســەلامیان لێ بكرێــت وەك وەڵامی سەلامیان دەدرێتەوە، ئەمەش لــە عبــدالله ی كــوڕی عــەباس‌و ئــەبی ئومامــەو ئــیبن موحــەیریز گێڕڕاوەتــەوە، وە بۆچــونێكە لــە مەزهەبی ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خــودای لێ بێــت‌و دەڵێــت: تــەنها (السلام عليك)ی لێ دەكرێت بەتاك‌و بەبێ (ورحمة الله).

هەنــدێ ووتویانــە: دروســتە ســەلام كــردن بــۆ بەرژەوەنــدی پێویست ،یان ترس، یان خزمایەتی، یان هۆیەك پێویست بكات، ئەمەش ڕای ئیــبراهیم نەخــەعی‌و عەلقەمەیــە، ئــەوزاعی دەڵێــت: ئەگــەر ســەلامت كــرد ئــەوە پیاوچــاكان كردویانــە، وە ئەگــەر سەلامت نەكرد ئەوا پیاوچاكان نەیانكردووە.

بۆ وەڵامدانەوەی سەلامیان زانایان ڕای جیاوازیان هەیە، زۆرینە دەڵێن: واجبەو ئەمەش ڕای دروستە، هەندێك دەڵــێن: واجــب نیــە، وەك واجــب نیــە وەڵامــی ســەلامی بیدعەچــیەكان بدرێتــەوە، ڕای

یەکەم ڕاستو دروستە، جیاوازییان ئەوەیە، ئێمە فەرمانمان پێ کراوە بە دوورکەوتنەوە لە ئەهلی بیدعە تا بەئاگا بێنەوەو ئاگاداربین لێ یان، بە پێچەوانەی ئەهلی زیمە).[1]

ئەوەی ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهو شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیەو ئیبنو قەییم باسیان کردوە لەڕون کردنەوەی هۆی ووتنی فەرمودەکە ئەوە ڕاستەو ڕیوایەتە صەحیحەکان پاڵپشتی دەکەن.

## سەلام کردن لە مەجلیسێکی تێکەڵ لە موسڵمان و ناموسڵمانەکان

بوخاری سەرباسێکی نوسیوە (سەلام کردن لە مەجلیسێکی تێکەڵ لە موسڵمانانو موشریکەکان)و فەرمودەکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی هێناوە، پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە –نەخۆش بوو– پاش غەزای بەدر: (مر في مجلس فيه أخلاط من المسلمين والمشركين عبدة الأوثان واليهود وفيهم عبد الله بن أبي ابن سلول، وفي المجلس عبد الله بن رواحة، فلما غشيت المجلس عجاجة الدابة خمر عبد الله بن أبي أنفه بردائه ثم قال لا تغبروا علينا، فسلم عليهم النبي صلى الله عليه وسلم ثم

---

[1] زاد المعاد ٢/٣٣٨ .

وقف فنزل فدعاهم إلى الله وقرأ عليهم القرآن، فقال عبد الله بن أبي ابن سلول أيها المرء لا أحسن من هذا إن كان ما تقول حقا، فلا تؤذنا في مجالسنا، وارجع إلى رحلك فمن جاءك منا فاقصص عليه)[1] واته: پێغەمبەر ﷺ دای بەناو مەجلیسێکی تێکەڵ لە موسڵمانانو موشریکە بت پەرستەکانو جولەکە، عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولشیی تێدابوو، لە مەجلیسەکەدا عبدالله ی کوڕی رەواحەی تێدابو، کاتێك تەپوتۆزی وڵاغی سواریەکەی هات بەسەریان دا عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بە کراسەکەی لوتی خۆی گرتو ووتی: تەپوتۆز مەکەن بەسەرماندا، جا پێغەمبەر ﷺ سەلامی لێکردنو، پاشان وەستاو دابەزیە خوارەوەو بانگی کردن بۆلای خوداو قورئانی خوێند بەسەریاندا، جا عبدالله یکوڕی ئوبەی کوڕی سەلول ووتی: ئەی پیاو ئەگەر ئەمەی تۆ دەیڵێیت حەق بێت ئەوا لەوە جوانتر نییە، جا لە دانیشتنەکاندا ئەزیەتمان مەدەو بگەڕێوە بۆ شوێنی خۆت، جا هەرکەس لە ئێمە هات بۆلات بۆی باس بکە).

[1] الجامع الصحيح كتاب الاستئذان ح رقم ٥٨٩٩ .

بەیهەقی بەم شێوەیە گێڕاویەتیەوە: (أن النبي صلى الله عليه وسلم مر بمجلس فيه أخلاط من المسلمين واليهود والمشركين عبدة الأوثان فسلم عليهم أجمعين).[1]

واتە: (پێغەمبەر ﷺ دای بەلای مەجلیسێکی تێکەڵ لە موسڵمانانو جولەکەکانو هاوەڵ دانەرە بت پەرستەکانو سەلامی لە هەمویان کرد) بەیهەقی دەڵێت: بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە.

وە لە (مصنف)ی عەبدوڕڕەزاق دا هاتووە بەبێ (أجمعين)[2] واتە: (هەمویان).

ئەمەش سونەتێکی کرداریە تەئکیدی ئایەتە گشتی یەکانی قورئانو دروستی سەلام کردن لە ناموسڵمانەکان دەکاتەوە.

وە ئەوەی دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ مەبەستی لە سەلام کردنەکە موسڵمانەکان بووە جێی سەرنجەو لادانە لە فەرمودەکە! ڕونە مەجلیسەکە هی عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بووەو ئەو سەرگەورەیان بوو، ناموسڵمانەکان زۆرینەبوون، ڕاوەستانی پێغەمبەر ﷺو بانگ کردنیان بۆ

---

[1] شعب الإيمان ٦/٤٦٤ .

[2] المصنف ١٠/٣٩٢ وإسناده على شرط الصحيحين.

ئیسلامو خوێندنی قورئان بۆیان، ڕون ترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستاوەو سەلامی لێ کردون، بۆ ئەوەی بانگیان بکات بۆ ئیسلام، نەك بۆ ئەوەی دابنیشێت لەگەڵیان، ئەوانەی خۆیان ماندو کردوەو هەوڵی کۆکردنەوەو تەئویلیان داوە بەهۆی فەرمودەکەی سوهەیلەوە بوە (لا تبدؤوا المشركين بالسلام)[1] واتە: (سەلام مەکەن لە هاوەڵ دانەران).

## سەلامی ئادەم و نەوەکانی

ئەم سونەتە کرداریە پاڵپشتی دەکرێ بە فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە لە (بوخاریو موسلیم)دا هاتووە، خوای گەورە فەرموی بە ئادەم —فەرمودەی قودسی یە— (اذهب فسلم على أولئك النفر، وهم نفر من الملائكة جلوس فاستمع ما يجيبونك فإنها تحيتك وتحية ذريتك، قال فذهب فقال:السلام عليكم! فقالوا السلام عليك ورحمة الله! قال فزادوه ورحمة الله)[2] واتە: (برۆ سەلام لەئەوانە بکە، ئەوان دەستەیەك فریشتە بوون، دانیشتبون، گوێ بگرە چیت وەڵام دەدەنەوە، ئەوە سەلامی خۆتو نەوەکانتە، دەڵێت: ڕۆشتو وتی (السلام عليكم)! جا ووتیان (السلام عليك ورحمة الله) دەڵێ

---

[1] انظر فتح الباري ٣٩/١١ ، وشرح النووي ١٤٥/١٤ .

[2] البخاري ح رقم ٣١٤٨، ومسلم ح رقم ٢٨٤١ .

(ورحمة الله) یان بۆ زیـاد کـرد). ئەمـەش ڕونـە ئـەم سـەلام کردنـە گـشتی یـە، سـەلامی ئـادەمو نـەوەکانی دوای خۆیـەتی، لـەنێو خۆیاندا سەلام لە یەکتری دەکەن.

هـەموو ئـەو بەڵگانـەی قورئـانو ئـەو فـەرمودە صـەحیحو مەشـهورانەی پێـشتر باسـکرا، بۆچـونی ئـەبو ئومامـەی بـاهلیو عبـدالله ی کـوڕی عـەباس – ڕەزای خوایـان لەسـەر بێـت– و وە بۆچونی ئەوانەی هەمان بۆچونیان هەیە هاوسەنگو پشت ڕاست دەکاتەوە، کە دروستە سەلام کردن لە ناموسڵمانان.

## ڕونکردنەوەی فەرمودەی ئەو هاوەڵانەی ڕای پێچەوانە دەگەیەنێت

نەزانراوە لە هاوەڵان کەسیان ڕای پێچەوانەی هەبێت مەگـەر ئەوەی دەگێردرێتەوە لە:

### ١- عبدالله ی کوڕی عومەر

(عبدالله دای بەلای گاورێکداو سەلامی لێ کرد، ئەویش وەڵامی دایـەوە عبـدالله کاتێـك زانـی گـاورە، گەڕایـەوە بـۆلایو ووتـی: سەلامەکەم لێ بگێـڕەوە)[١] شـەیخ ئـەلبانی دەڵێـت: (ئەوانـەی لێ

---

[١] البخاري في الأدب المفرد أثر رقم ١١١٥ .

یان گێڕاوەتەوە  سیقەن جگە لـە عبـدلڕەحمانی کـوڕی محمـدی کوڕی زەیدی کوڕی جەدعان نەناسراوە، بەڵام شاهیدی هەیە لـە فەرمودەکەی عوقبەی کوڕ عامری جوهەنی).[1]

بەیهەقی بەم شێوە دەیگێڕێتەوە لەڕێگەی ئـیبن وەهـەب لـە سیڕری کوڕی یـەحیا (عبـدالله ووتـی: سـەلامەکەم لێ بگێـڕەوە ! ئەویش پێی ووت: بـەڵێ! بـێ گومـان لـێم گێڕایتـەوە ! عبـدالله ووتی: خودا ماڵو منداڵت زۆربکات).

عەبـدوڕڕەزاق لـە مەعمـەری کـوڕی قـەتادەوە دەیگێڕێـەوە (عبدالله ی کوڕی عومەر سەلامی کرد لە جولەکەیەك نەیدەناسی، هەواڵیان پـێ دا جولەکەیە، جا گەڕایەوەو ووتـی: سـەلامەکەم لێ بگێڕەوە، جا ووتی: بێ گومان وام کرد).[2]

---

[1] إرواء الغليل ١١٤/٥، وانظر تهذيب التهذيب ٢٤٠/٦ والتقريب رقـم ٤٠٠١ في ترجمـة عبـد الرحمن بن محمد حيث نقل توثيق النسائي وابن حبان له فليس هو مجهول الحال علـى الـصحيح، وانظـر الاخـتلاف في شـأنه في تهـذيب الكمـال ٣٩٣/١٧ . ورواه ابـن سـعد في الطبقات ١٦٦/٨ ، وإسناده على شرط مسلم، وفيه العمري متكلم في حفظه.والبيهقي في شعب الإيمان ٤٦٢/٦ من طريق ابن وهب عـن عبـد الله بـن عمـر عـن نـافع عـن ابـن عمـر وإسناده صحيح، ومن طريق ابن وهـب عـن الـسري بـن يحيـى عـن سـليمان التيمـي بـه ورجاله ثقات غير أن التيمي لم يسمع من ابن عمر ، وانظر تهذيب التهذيب ١٧٦/٤ .

[2] المصنف ٣٩٢/١٠ .وهذا إسناد صحيح إلى قتادة إلا إنـه لم يـسمع مـن ابـن عمـر غير أنه يتقوى بما سبق، وانظر جامع التحصيل رقم ٦٣٣ .

## ٢- عوقبەی كوڕی عامیر

(عوقبە دای بەلای پیاوێك دا، شێوەی لە موسڵمان دەچوو سەلامی لێ كرد ئەویش وەڵامی دایەوە بە (علیكم السلام ورحمة الله وبركاته) خزمەت كارەكەی پێی ووت ئەوە گاورە عوقبە هەستاو شوێنی كەوت تا پێی گەشتەوە، جا ووتی: بێ گومان (رحمة الله وبركاته) بۆ موسڵمانانە، بەڵام خوداش تەمەن درێژت بكاتوماڵو منداڵت زۆر بكات).

لەڕیوایەتێكی تردا (عوقبە دای بەلای پیاوێكدا شێوەی لەشێوەی پیاوێكی موسڵمان دەچوو، جا سەلامی لێ كرد عوقبە وەڵامی دایەوەو ووتی: (وعليك رحمة الله وبركاته)! جا خزمەتكارەكەی پێی ووت: دەزانی وەڵامی كێت دایەوە؟ ووتی: ئەو موسڵمان نەبوو! وتیان: گاورە، جا عوقبە هەستاو شوێنی كەوت تا پێی گەشتەوە، جا ووتی: (رحمة االله وبركاته) لەسەر موسڵمانانە، بەڵام خودا تەمەن درێژت بكاتو ماڵت زۆركات). [1]

---

[1] البخاري في الأدب المفرد ح رقم ١١١٢ حدثنا سعيد بن تليد قال حدثنا ابن وهب قال أخبرني عاصم بن حكيم أنه سمع يحيى بن أبي عمرو السيباني عن أبيه عن عقبة بن عامر الجهني، والبيهقي في السنن الكبرى ٢٠٣/٩ من طريق ابن وهب

ئـەو بەسـەرهاتەی عبـدالله کـوڕی عومـەر ئـیبن وەهـەبیش گێڕاویەتیەوە، جارێك لە عبدالله کوڕی عومەر جارێك لە عوقبـەی کوڕی عـامر! بـەڵام لـە فەرمودەکـەی عوقبـەدا سـەلام کەرەکـە گاورە، بێگومان عوقبە لەم وەڵامە زیـادە (ورحمـة الله وبرکاتـە) پەشیمان بویەوە، نەك لە وەڵامدانـەوەی هـەموو سـەلامەکە، وە لەبەر ئەوە هۆکەی باسکردو پاساوەکەی پیێ ووت کە (رحمة الله وبرکاتە) بۆ موسڵمانە و پێی وت: (خودا تەمەن درێـژت بکـات و ماڵ و منداڵت زۆر بکات) لەبەسەرهاتی عبدالله ی کوڕی عومەردا عبدالله سەلامی کردوەو پەشیمان بووە لە سەلامەکەی!

ڕوون و ئاشکرایە تـەنها بەسـەرهاتی عبـدالله ی کـوڕی عومـەر چەسپاوە.

---

بە.وقال الألباني في تعليقه علـى الأدب المفـرد ، وفي إرواء الغليـل ١١٤/٥ (إسـناد حسن).

# بەشی چوارەم
# ئەو فەرمودانەی لە وەڵامدانەوەی
# سەلامی نا موسڵماندا هاتوون

لە وەڵامدانەوەی سەلامی جولەکەدا جگە فەرمودەکەی ئەبی بەسرەتی غیفاریو ئەبی عەبدوڕڕەحمانی جوهەنی فەرمودەی تر هاتووە لەوانە:

١- فەرمودەی عبدالله ی کوڕی عومەر لە بوخاریو موسلیم دا هاتووە وەك پێشتر باسکرا، ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو دەڵێت: سوفیانی کوڕی عوینە بۆی گێڕاینەوە کە بیستویەتی لە ئیبن دینار لە عبدالله ی کوڕی عومەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی (إذا سلم عليك اليهود فإنما يقول: السام عليك! فقل: وعليك! وقال مرة: إذا سلم عليكم اليهود فقولوا و عليكم فإنهم يقولون السام عليكم).[١]

---

[١] المسند٢/٩ وإسناده على شرط الصحيحين.

واتــە: (هــەرکاتێك ئــەو جولەکەیــە ســەلامی لێ کردیــت ئــەوە بێگومان دەڵێـت: بمریـت! جـا بڵـێ: خـۆت! جارێـك فـەرمووی: هەرکاتێ ئەو جولەکانە سەلامیان لێ کردن، بڵێن لەسەر خۆتـان، چونکە ئەوان دەڵێن: بمرن).

٢- فەرمودەکەی عائیشە، دەڵێت: کۆمەڵێك جولەکـە هـاتن بۆ خزمەتی پێغەمبـەر ﷺ: (قـالوا الـسام علـيكم! قالـت عائـشة ففهمتها فقلت وعليكم السام واللعنة! قالت فقـال رسـول الله صـلى الله عليه وسلم (مهلا يا عائشة إن الله يحـب الرفـق في الأمـر كلـه ) فقلت يا رسول الله أو لم تسمع ما قالوا؟ قال رسول الله صـلى الله عليه وسلم ( قد قلت وعليكم).[١]

واتــە: (وتیـان: بمـرن) عائـشە دەڵێـت: جـا تێگەیـشتمو وتم: مردنو نەفرین لەخۆتان! پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەی عائیـشە لەسەر خۆت بە بەڕاستی خودا نەرمونیانی پێ خۆشە لە هــەموو کارێکدا) ووتم: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا گوێت لێ نەبوو چییان ووت؟ پێغەمبـــەری خـــودا ﷺ فـــەرمووی: (مـــن وتم: لەســـەر خۆتان).

[١] البخاري في الجامع الصحيح ح رقم ٢٧٧٧ و٥٦٧٨ ، ومسلم ح رقم ٢١٦٥ .

لەڕیوایەتێکی تـردا فـەرموی: (أن اليهـود أتـوا الـنبي صـلى الله عليه وسـلم فقـالوا الـسام علـيكم فقالـت عائـشة علـيكم ولعـنكم الله وغضب الله عليكم . قال (مهلا يا عائشة عليك بالرفق وإياك والعنـف والفحش )، قالت أو لم تسمع ما قالوا؟ قال (أو لم تسمعي مـا قلـت ؟ رددت عليهم فيستجاب لي فيهم ولا يستجاب لهم فيّ).[1]

واتە: (جولەکەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتیان: (بمرن) یان مردنتان لەسەر بێـت، عائیـشە ووتـی: (ئێـوە بمـرن‌و نـەفرینی خواتــان لێ بێــت‌و غــەزەبی خــوا برژێــت بەســەرتاندا) پێغەمبــەر ﷺ فـەرموی: عائیـشە لەسـەر خۆبـەو دەبـێ نـەرم‌و نیـان بیـت‌و دوربکـەوە لـە توندوتیـژی‌و قـسەی ناشـرین، وتــی: تـۆ وام پــێ دەفـەرمویت، ئایـا گوێـت لێ نـەبوو چـییان وت؟ فـەرمووی: (ئـەی گوێت لێ نـەبوو ئـەوەی مـن ووتم؟ وەڵامـم دانـەوە جـا دوعـای مـن وەرگیرا لە دژی ئەوان‌و لە ئەوان وەرنەگیرا لەدژی من).

٣- فەرمودەی جابری کوڕی عبدالله دەڵێت (سـلم نـاس مـن يهود على رسـول الله فقـالوا الـسام عليـك يـا أبـا القاسـم! فقـال: (وعليكم) فقالت عائشة: وغضبتُ، ألم تسمع ما قالوا؟ قال: (بلي قد سمعت فرددت عليهم، وإنا نُجاب عليهم ولا يجابون علينا).[2]

---

[1] البخاري في الجامع الصحيح ح رقم ٥٦٨٣ .

[2] صحيح مسلم ح رقم ٢١٦٥ .

واتە: (خەڵکێکی جولەکە سەلامیان لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو ووتیان: بمریت ئەی باوکی قاسم، فەرمووی: لە (خۆتان) عائیشە دەڵێت: تورە بووم، ئایا نەتبیست چیان ووت؟ فەرمووی: (بەڵێ بیستمو بەرپەرچم دانەوە لە ئێمە وەرگیراو لە ئەوان وەرنەگیرا).

٤- فەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: جولەکەیەك دای بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ ووتی: بمریت! پێغەمبەر ﷺ خوا فەرموی: خۆت! جا پێغەمبەری خوا فەرموی: (أتدرون مايقول؟ قال: (السام عليك) قالوا يا رسول الله الا نقتله؟ قال: (لا إذا سلم عليكم أهل الكتاب فقولوا وعليكم).[١]

واتە: (ئایا دەزانن چی دەڵێت؟ وتی (بمریت) ووتیان: ئەی پێغەمبەری ﷺ خودا ئایا نەی کوژین؟ فەرمووی (نەخێر، هەرکاتێك ئەهلی کیتاب سەلامی لێ کردن، ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان).

لە ڕیوایەتێکی ترەوە لە ئەنەس: جولەکەیەك دای بەلای پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دا، جا ووتی: بمرن! ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنما قال السام عليكم)،فأخذ

[١] البخاري في الجامع الصحيح ح رقم ٥٦٢٧ .

اليهودي فجيء به فاعترف، قال النبي (ردوا عليهم ماقالوا).[1] واتـه: (بێگومان ووتی: بمرن، جا جولەکەکـە گـیراو هێنـراو دانـی پێـدانا، پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: (وەڵامـی سـەلامەکانیان بـدەرەوە) لـە ڕیوایەتێکی تردا فەرموی (ردوا عليه كما قـال)[2] واتـە: (وەك خـۆی وەڵامی بدەنەوە).

واتە: تـەنها ئـەوەی لەگەڵدا بکـەن‌و لێ ی مـەدەن، هـەروەك هەندێ لە هاوەڵان ویستیان لێیبدەن.

هـەموو ئـەم فـەرمودە ڕاسـتانە وەڵام دانـەوەی سـەلام دوپـات دەکەنـەوە وەك خـۆی (وعلـيكم) واتـە: (ئـەوەی دەیڵـێین لەسـەر خۆتـان بێـت)، ئـەوەی دەیڵێـت جـا چـاك بێـت یـان خـراپ، ئـەم بڕیـارەیش لەبـەر هۆکارێکـە، وەك دەفـەرموێت: (إذا سـلم عليـك اليهود، فإنما يقول: السام عليك! فقل وعليك).

واتــە: (هــەرکاتێك جولەکەکــە ســەلامی لێ کردیــت، ئــەوە بێگومان دەڵێت: بمریت، جا بڵێ: خۆت).

وە دەفەرموێت: (إذا سلم عليكم اليهود فقولوا وعليكم، فـإنهم يقولون: السام عليكم).

---

[1] أحمد من المسند ٣\٢٨٩، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

[2] المسند ٥\٤١٠ رقم ٣٠٨٩، وإسناده صحيح على شرط الشيخين.

واتــە: (هــەرکاتێك جولەکــەکان ســەلامیان لێ کــردن، بڵــێن: لەخۆتان، ئەوە بێگومان ئەوان دەڵێن: بمرن).

پیتی (الفاء) بـۆ تــەرتیبو هـاتنی ڕاسـتەوخۆی حوکمەکەیـە لەســەر هۆکــەی، لــە فەرمودەکــەدا هۆکارەکــەی بـاس کــردوەو دەفەرمویّت (فإنهم یقولون السام علیکم) واتــە: (ئــەوە بێگومـان ئەوان دەڵێن: بمرن)، وە ئەم فەرمودانە نەهی کردوە لە قـسەی خراپو ناشـرین لـەکاتی وەڵام دانەوەیانـدا، وەك عائیـشە پــێی ووتــن (علیــك الــسام والــذام) واتــە: (مــردنو کــەمو کــوڕیو عەیبداریتان لەسەر بێ) یان ووتـی: (یاإخوان القردة والخنازیر...) واتە: (ئەی هاوەڵانی مەیمونو بەرازەکان).

هەروەك ڕێگەی هاوەڵانی نەدا بە کوشتن یـان ئەزیـەت دانـی ئەو کەسانەی وایان دەوت، بەڵکو فەرمانی کرد نـەرمو نیـان بـن لەگەڵیان دا.

ئـەم فەرمودانـە نابێـت گـشتاندنی بـۆ بکرێـت، بـەڵکو تایبەتـە بەوانەی بە شێوەی ناشیرینو خراپ سەلام دەکەن لە موسـڵمانان، وە تەنها بە (وعلیکم) وەڵامیان بدرێتەوە وەك خۆیان، بـەبێ پـەنا بـردن بـۆ قـسەو قـسە لۆك، ئەمـەش لـە ڕەوشـتی ئیـسلامو ئـەو خوڕەوشتانەیە هێناویەتی، بەڵام ئەوەی بەجوانیو ووشەی جـوان سـەلام دەکـات، ئـەوا پێویـستە وەك خـۆی یـان باشـترو جـوانتر

وەڵامــی بدرێتــەوە، بــەڵام کارناکرێــت بــەو فەرمودانــەی تــەنها (وعلیکم)ی تێدایە،و بەپێی ڕای زۆرینەی زانایان ئەم وەڵامدانەوە پێچەوانەی مانای گشتی ئـەم ئایەتەیـە (وَإِذَا حُيِّيـتُمْ بِتَحِيَّـةٍ فَحَيُّـوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَـى كُـلِّ شَـيْءٍ حَـسِيباً)[1] واتـە: ئەوسا هەرکاتێك سەلامتان لێ کرا وەڵامی ئەو سەلامە بدەنـەوە بـە باشتر لەخۆی، یان وەکو خۆی، بـەبێ گومـان الله ئاگـای لەهـەموو شتێکەو حیساب لەسەر هەموو شتێك دەکات).

بەدەقی قورئان پێویستە وەڵام دانەوەکە وەك خـۆی بێـت یـان باشتر نـەك تـەنها (وعلـیکم)، چـونکە ئەمـە تایبەتـە بـەو کەسـەی دەڵێـت: (الـسام علیـك) واتـە: (بمریـت) یـان ووشـەی لـەو جـۆرە، (علیك) یان (علیکم) هـەر سـڵاو نیـەو ناچـێتە مانـای ئایەتەکـەوە، چونکە سڵاو دوعایە بـە (ژیـان) وە (الـسام) واتـە (مـردن) دوعایـە (بەشـــەڕ)و تـــەنها بـــە (علیـــك) بۆتـــاكو (علـــیکم) بۆکـــۆ وەڵام دەدرێتەوە، واتە ئەوەی وتتان.

ئیبن جـەریر طـەبـەری دەڵێـت: ئایـەتی (وإذا حییـتم بتحیـة) ئەوسا هەرکاتێك دوعای تەمەن درێژیو مانەوەو لەش ساغی یان

---

[1] سورة النساء آية ٨٦.

بۆكردن، (فحيوا بأحسن منها) جا ئێوەش باشتر لەوان دوعايـان بۆ بكەن (أوردوها) يان وەك خۆی سڵاوەكەيان لێ بكەنەوە).[1]

هەنـدێك لـە گێڕەوەكـانی فەرمودەكـەی ئەنـەس باسـی ڕوداوەكـەيان نـەكردوەو ماناكـەيان تێكـداوە، لـە ئيمـامی ئەحمەدەوە دەڵێت: هەشيم بـۆی گێڕاينـەوە، دەڵێـت عوبەيـدی كوڕی ئەبی بەكری كوڕی ئەنەس هـەواڵی پێـداين لـە باپيريـەوە ئەنەسی كـوڕی ماليـك دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی (إذا سلم عليكم أهل الكتـاب فقولـوا: وعلـيكم)[2] واتـە: (هـەركاتێك ئـەهلی كيتاب سەلاميان لێ كردن، ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان).

ئيمامی ئەحمـەد دەڵێـت: يـەحيا بـۆی گێڕاينـەوە لـە شـوعبەو قـەتادەو ئـيبن جەعفـەر بۆيـان گێڕاينـەوەو دەڵێـت شـوعبە بـۆی گێڕاينەوە ووتی: گوێم لە قەتادە بو لـە ئەنـەس دەڵێـت: هـاوەڵان پرسياريان كرد لە پێغەمبەرﷺ ووتيان: ئەهلی كيتـاب سـەلامان لێدەكەن، ئێمە چۆن وەڵاميان بدەينەوە؟ فەرمووی بڵێن (وعليكم) واتە: (لەسەر خۆتان) حەججاج وەك ئەمەی گێڕاوەتـەوە، شـوعبە دەڵێت: پرسيارم نەكرد لە قەتادە ئايا گوێت لە ئەنەس بوە؟[3]

---

[1] جامع البيان للطبری ٤\١٩٠ سورة النساء آية ٨٦.

[2] المسند ٣\٩٩، وإسناده صحيح علی شرط الشيخين.

[3] المسند ٣\١١٥، وإسناده صحيح علی شرط الشيخين.

قەتادە ناسراو بووە بە تەدلیس[1]–[2]وە شوعبە بە (بیستن)نەی گێڕاوەتەوە، وەك گومانی بوبێت كە قەتادە –بەم شێوە كورت كراوە– بیستبێتی لە ئەنەس، چونكە فەرمودەكە گشتی یەو وەك ئەوەی هاوەڵان بەگشتی پرسیاریان كردبێت لە حوكمی وەڵام دانەوەی سەلامی ئەهلی كیتاب، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردن تەنها بە (وعلیكم) وەڵام بدەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها بۆ وەڵام دانەوەی ئەو كەسانە فەرمویەتی كە دەڵێن: (السام علیكم) واتە: (بمرن) نەك بۆ وەڵام دانەوەی سەلامی هەمو كەسێكی ئەهلی كیتاب، بەو هۆیەوە بوخاریو موسلیم ئەم فەرمودەیان نەگێڕاوەتەوە لە ئەنەس لەڕێگەی قەتادەوە لەگەڵ ڕێزو گەورەییدا.

هەروەها ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە دەڵێت: ئیسماعیلی كوڕی عولەییە بۆی گێڕاینەوە لە ئیبن عەون لە حەمیدی كوڕی ڕاهەوەیە دەڵێت: ئەنەسی كوڕی مالیك ووتی: (نەهیمان

---

[1] التدليس: إخفاء عيب في الإسناد وتحسين لظاهره، والتدليس قسمان: ١– تدليس الاسناد. ٢– تدليس السيوخ.

[2] انظر طبقات المدلسين للحافظ ابن حجر رقم ٩٢.

لێکراوه، یان وتی: فەرمانمان پێ کراوه له وەڵامدانەوەی سەلامی ئەهلی کیتاب له (وعلیکم) زیاتر بڵێین) [1].

هەموو ئەو ڕیوایەتانه کورتەیەکه لەو ڕیوایەته درێژەی ئەنەس لەبەسەرهاتی ئەو جولەکەیەی سەلامی کردو ووتی (السام علیکم) واته (بمرن)، هەندێ له هاوەڵان ویستیان ئازاری بدەن، پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردن، وه فەرمانی پێ کردن له (وعلیکم) زیاتر نەڵێن، واته: ئەزیەتی نەدەن‌و شەڕی لەگەڵ نەکەن‌و قسەی ناشرینی پێ نەڵێن. تەنها بڵێن (وعلیکم)، جا هەندێ له ڕاویەکان فەرمودەکەیان کورت کردۆتەوەو بەسەرهاتەکەیان لێ لابردوەو بوەته: (أمرنا أن لا نزيد أهل الكتاب على (وعليكم)) واته: فەرمانمان پێ کراوه له وەڵامدانەوەی ئەهلی کیتاب له (وعلیکم) زیاتر نەڵێین. وه هەندێکیان وا لێ ی تێگەشتون که نەهی یان لێ کراوه دوای (وعلیکم) بڵێن (السلام) یان بڵێن (ورحمة الله وبركاته) لەگەڵ ئەوەشدا تەنها نەهی یان لێ کراوه له وتنی ووشەی ناشیرین‌و جنێودان وەك عائیشه ووتی لەکاتی وەڵام دانەوەیاندا. فەرمانیان پێ کراوه تەنها بڵێن (وعلیکم).

---

[1] المسند ١١٣/٣ وإسناده ضعيف قال الألباني في الإرواء ١١٦/٥ (حميد هذا مجهول) وهو كما قال.

# بەشی پێنجەم
# ڕای پەسەند

ڕای پەسەند لەکۆی ئەو فەرمودانەدا ئەوەیە: سەلام کردن لە ناموسڵمان قەدەغە نی یە، تەنها لەکاتی جەنگ دا نەبێت، تا سەلام کردنەکە نەبێتە ئەمنو ئەمانو حوکمی ئەمانی لێ وەرنەگیرێت، جگە لەکاتی جەنگ دا سەلام کردن لە موسڵمانو ناموسڵمان موستەحەببە، هەروەك لە زۆرێك لە هاوەڵانەوە هاتووە –ڕەزای خوایان لێ بێت– ئەوانەی ووتەیان هەبووە لەم بابەتەدا.

## ڕای پەسەند لەدەقە گشتی یەکانی قورئاندا

لەدەقە گشتی یەکانی قورئاندا بەڕونی دەردەکەوێت کە دروستە سەلام کردن لە ئەهلی کیتاب، ئەمەش (راجح) پەسەندو هاوسەنگ لای قورطوبی[1]یە وەك دەڵێت: (هەندێك لە (سلف)

[1] الجامع لاحكام القران ١٠٣/١١..

پێشینان سەلام کردن لەبێ باوەڕ بەدروست دەزانن. ووترا بە ئیبن قوتەیبە: ئایا دروستە سەلام کردن لەبێ باوەڕ؟ ووتی: بەڵێ، خودا دەفەرموێت: (لاَ يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِم إِنَّ اللَّه يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ).[1]

واتە: (خودا ڕێگەی لە ئێوە نەگرتووە لەگەڵ ئەو کەسانەدا شەڕیان لەگەڵدا نەکردون لەسەر ئاین‌و لەسەر زەوی‌و زاری خۆتان دەریان نەکردون کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن، چونکە بەڕاستی خودا دادپەروەرانی خۆشدەوێت).

وە دەفەرموێت: (قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ)[2] واتە: (بەڕاستی بۆ ئێوە پێشەنگیەکی جوان هەیە بۆ فێربونی خودا ناسی ڕاستەقینە لە ئیبراهیم ) وە ئیبراهیم وتی بە باوکی: (سلام علیك)[3] واتە: (سەلامت لێ بێ) ووتم: ئەوەی سوفیانی کوڕی عوەینە دەیڵێت زۆر ڕونە لە ئایەتەکەدا).[4]

---

[1] سورة المتحتة آية ٨.

[2] سورة المتحتة آية ٤.

[3] سورة مريم آية ٤٧.

[4] الجامع لاحكام القرآن ١٠٣/١١.

پاشان قورطوبی هیچی دەست نەکەوتووە ئەم بۆچونەی پێ لابدات تەنها فەرمودەکەی سوهەیل نەبێت، کە دەڵێت: لەم باسەدا دوو فەرمودەی صەحیح هەیە:

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمویەتی: (لاتبدؤوا اليهود والنصارى بالسلام فإذا لقيتم أحدهم في الطريق فاضطروه الى اضيقه) واتە: (سەلام مەکەن لەو جولەکەو گاورانە، جا هەرکاتێك گەشتن بە یەکێکیان ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن) بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە، قورطوبی وا دەڵێت، بەڵام ئەوە لێتێکچونەو بوخاری نەیگێڕاوەتەوە.

لە بوخاریو موسلیم دا هاتووە لە ئوسامەی کوڕی زەید (أن رسول الله مرّ فى مجلس فيه أخلاط من المسلمين والمشركين عبدة الاوثان واليهود، وفيهم عبدالله بن أُبَيْ بن سلول، وفي المجلس عبدالله بن رواحة، فلما غشيت المجلس عجاجة الدابة خمر عبدالله بن أُبَيْ أنفه بردائه، ثم قال: لاتغبروا علينا! فسلم عليهم النبي...) واتە: (پێغەمبەری خوا ﷺدای بەناو مەجلیسێکی تێکەڵ لە موسڵمانانو هاوەڵ دانەرە بت پەرستەکانو جولەکە، عبدالله کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول یان تێدابو، عبدالله ی کوڕی ڕەواحەش لە مەجلیسەکەدابو، کاتێك تەپوتۆزی وڵاغی

سـواریەکەی هـات بەسـەریاندا، عبـدالله ی کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سەلول بە کراسەکەی لوتی خۆی گرتو ووتی: تەپو تۆز مەکەن بەسەرماندا، جا پێغەمبەر ﷺسەلامی لێ کردن...) فـەرمودەی یەکەم سەلام لێ نـەکردنیان دەگەیـەنێت، چـونکە سـەلام کـردن ڕێزەو بێ باوەڕ شایستەی نیە، فەرمودەی دووەم سـەلام کـردن بە دروست دەزانێت.

طــەبــەری دەڵێــت: (فەرمودەکــەی ئوســامە پێــچەوانەی فەرمودەکـەی ئـەبو هـورەیرە نیـە، چـونکە لـە هـیچ کامیانـدا پێـچەوانەی ئـەوی تـری تێـدا نیـە، چـونکە فەرمودەکـەی ئـەبو هورەیرە گشتی یەو، فەرمودەکەی ئوسامە ئەوە ڕون دەکاتەوە کە ماناکـەی تایبەتـە، نەخـەعی دەڵێـت: (ئەگـەر پێویـستیەکت هەبو بە جولەکەیەك یـان گاورێـك ئـەوە سـەلامی لێ بکـە) بەمـە دەرکەوت فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە (لاتبدؤوهم بالسلام) واتە: (سەلامیان لێ مەکـەن) ئەگـەر سـەلام کردنەکـە بـێ هۆبـو، وەك پێویستی یان مافی هاوڕێ یەتی یان دراوسێیەتی یان سەفەر... هتد

طەبەری دەڵێت: (گێڕراوەتەوە لە پێشینان ئەوان سـەلامیان لە ئەهلی کیتاب کردوە، ئیبن مەسعود سەلامی لە سەرۆك هۆزیك کردوە هاوڕێ یەتی کردبوو لەڕێگەدا، عەلقەمە دەڵێت: پێم ووت

ئەی باوکی عەبدورڕەحمان ئایا مەکروهـ نیە سەلام لێ کردنیـان؟ ووتـی: بەڵێ، بەڵام مافی هاوڕێ یەتیەکەیە)[1].

(ئەبو ئومامە کاتێك دەگەڕایەوە بـۆماڵـەوە، نەیئـەدا بـەلای موسڵمانێك یان گاورێك یان بچوکێك یان گەورەیەك ئیلا سـەلامی لێ دەکرد، لەوەدا پێی وترا، جا ووتـی: فـەرمانمان پـێ کـراوە، سـەلام بڵاوبکەینـەوە، پرسـیارکرا لـە ئـەوزاعی دەربـارەی ئـەو موسڵمانەی دای بەلای بێ باوەڕێکـداو سـەلامی لێ کـرد؟ ووتــی: ئەگەر سەلامت کرد ئەوە پیاوچاکانی پێش تۆ کردویانە، ئەگـەر سەلامت نەکرد، ئەوە پیاوچـاکانی پـێش تـۆ نـەیان کـردوە، لـە حەسەنی بەصری دەگێڕنـەوە کـە وتویـەتی: ئەگـەر دات بـەلای مەجلیسێکداو موسڵمانانو بێ باوەڕانی تێدابو سەلامیان لێ بکە) قسەکانی طەبەری تەواو بوو.[2]

---

[1] رواها البيهقي في شعب الإيمان ح رقم ٨٩١٠ ، وفي الإسناد شريك بن عبدالله وفيـه ضعف، والروايات الصحيحة ليس فيها (نعم)ولا (بلى).

[2] االجامع لاحكام القران ١١\١٠٣.

## وەڵامدانەوەی سەلامی (مشركين) هاوەڵ دانەران

بەپێی ڕای پەسەندو ڕای زۆرینـەی زانایـان پێویـستە وەڵام دانەوەی سەلامی هاوەڵدانەران.

قـورطـوبی دەڵێـت: (دەیـەم: جیـاوازی هەیـە لەسـەر وەڵام دانەوەی سەلامی ئەهلی زیمە، ئایا واجبەوە وەك وەڵام دانەوەی سەلامی موسڵمانان؟ ئیبن عەباس و شەعبی و قەتادە ڕایان وایە، بـە دەسـت گـرتن بـەمانای گـشتی ئایەتەکـەو بەفـەرمانی وەڵام دانەوە لە فەرمودە دروستەکاندا).[1]

## وەڵام دانەوەی سەلام تەنها بە ( عليكم )

وەڵام دانەوەی سەلام تەنها بە (وعليكم) یان (وعليـك) تـەنها لە دوو کاتدا دەبێت:

یەکەم: لـەکاتی جـەنگ دا، ئەگـەر سـەلامیان کـرد وەڵامیـان نادرێتەوە بە (وعلـيكم الـسلام)، چـونکە سـەلام ئـەمنو ئەمانـە حوکمی ئـەمانی لەسـەر دروسـت دەبێـت، ئەمـەیش پێـچەوانەی کاتی جەنگە لەگەڵیاندا، لەبـەر ئەوەیـە پێغەمبـەر ﷺ لەغـەزای بەنی قورەیزەدا فەرمویەتی: (إني راكب الى اليهـود، فمـن انطلـق

---

[1] الجامع لأحكام القرآن ١١/١٠٣ .

معي منكم فلا تبدؤوهم بالسلام، فإن سلموا عليكم، فقولوا: وعليكم، فلما جئنا سلموا علينا، فقلنا وعليكم) واته: (من بەیانی بە سواری دەچم بۆلای جولەکەکان، هەرکەسێك لە ئێوە لەگەڵ مندا دەرچوو، با سەلامیان لیٚ نەکات، جا ئەگەر هاتو سەلامیان لیٚ کردن، ئەوا بڵێن: لەسەر خۆتان، کاتێك هاتین سەلامیان لیٚ کردین جا وتمان: لەسەر خۆتان).

ئەمەیش فەرمودەکەی ئەبی بەسرەتو ئەبی عەبدوڕرەحمانی جوهەنیو فەرمودەی سەوریو ئیبن دینار لە عبدالله کوڕی عومەری لەسەرەو لای بەیهەقی بەدورو درێژی هاتووە.

لەوکاتەدا نە سەلامیان لیٚ دەکرێتو نە وەڵامیان دەدرێتەوە بە سەلام، چونکە سەلام ئەمنو ئەمانەو پێچەوانەی کاتی جەنگە.

دووەم: ئەگەر بە شێوەی دوعای شەڕ سەلامیان کرد وەك (بمرن) بە (وعلیکم) وەك خۆیان وەڵامیان دەدرێتەوە، بەبیٚ ووتنی قسەی ناشیرینو خراپ. وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی لە ڕیوایەتی سوفیانی کوڕی عویەینە لە ئیبن دینار (إذا سلم عليك اليهود، فإنما يقول السام عليك! فقل وعليك) واتە: (هەرکاتێك جولەکەکە سەلامی لیٚ کردیت، ئەوە بیٚ گومان دەڵێت (بمریت) تۆش بڵیٚ: خۆت).

جارێك سوفیان یان شەیخەکەی دەیگێڕنەوە (إذا سلم علیکم الیهود فقولوا وعلیکم، فإنهم یقولون السام علیکم).

واتە: (هەر کاتێك جولەکەکان سەلامیان لێ کردن ئەوا بڵێن خۆتان، جا بێگومان ئەوان دەڵێن: بمرن).

ڕاشکاوەنەتر لەوەش ڕیوایەتی سوفیانی سەوری یە -لای ئیبن ئەبی شەیبە- لە عبدالله ی کوڕی دینار لە عبدالله ی کوڕی عومەر دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (إن الیهود إذا لقوکم وقالوا السام علیکم فقولوا لهم وعلیکم).

واتە: (بەڕاستی کاتێك جولەکەکان گەشتن پێتان، وە وتیان: بمرن، ئەوا پێیان بڵێن: خۆتان).

ئەمەش فەرمودەکەی عائیشەو جابیرو ئەنەس‌و عبدالله ی کوڕی عومەری لەسەرە.

جگە لەوە، ئەگەر سڵاویان کرد بە سڵاوێکی جوان، ئەوەی فەرمانی پێکراوە بەدەقی قورئان وەڵام دانەوەیەتی بە باشتر لەخۆی، ئەمەیش چاکترە، وەك ئایەتە کە ئامارژەی پێکردووە یان بەهاوتای خۆی وەڵامی بدرێتەوەو لەوە کەمتر نەبێت، وەك

ڕونەو ئاشکرایە لە ئایەتەکەدا (وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا)[1].

واتە: ئەوسا هەرکاتێك سەلامتان لێ کراو وەڵامی ئەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لەخۆی، یان وەکو خۆی)[2].

ئەمەیش ڕای ئیبن عەباسەو دەڵێت: (وەڵامی سەلام بدەنەوە، جولەکە بێت یان گاور یان ئاگر پەرست، چونکە خودا دەفەرموێت: (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا)[3].

واتە: (ئەوسا هەرکاتێك سەلامتان لێ کرا وەڵامی ئەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لەخۆی، یان وەکو خۆی)[4].

هەروەها ئەمەیش دەچێتە ناو مانای گشتی ئایەتەکە، ئەگەر موشریکێك ووتی: (السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) پێویستە وەك خۆی وەڵامی بدرێتەوە هەروەك سەلماوە لای ئیبن عەباس

---

[1] سورة النساء آية ٨٦.

[2] وانظر التحرير والتنوير للطاهر بن عاشور ص٩٩٧.

[3] سورة النساء آية ٨٦.

[4] البخاري في الأدب المفرد رقم ١١٠٧ وقال الألباني في تعليقه عليه (حسن )، ورواه ابن أبي شيبة في المصنف ٥/٢٥٠ من طريق سماك بن حرب عن عكرمة عن ابن عباس نحوه.

كه دەڵێـت: ئەگـەر فيرعـەون پێـی ووتم: (بـارك الله فيـك) واتـە: (خودا لێتپیرۆز كات) دەڵێم: لەتۆیش، فیرعەون مردویشە).[1]

ئیمـامی بوخـاری لـە (الادب المفـرد)دا هێناویـەتی لەبەشـی (چـۆن دوعـا دەكـات بـۆ زیمـی) مەبەسـتی ئـیبن عـەباس ڕون كردنـەوەی دروسـتی دوعـای خێـرو بەرەكەتـە بـۆ ناموسـڵمان، هەروەك لە ئیبنو عومەرو عوقبەی كوڕی عامرەوە هـاتووە كـە دوعـای (أكثـر الله مالـك و ولـدك) واتـە: (خـودا مـاڵو منـداڵت زۆربكات) یان كردووە بۆ زیمی، ئەمەیش بەرەكەتی دونیاییە.

## وەڵام دانەوەی سەلامی زیمی

ئیبن قەییم لەبەشی (چۆن وەڵامیان بدەینەوە ئەگـەر بۆمـان دەركەوت ئەوان ووتیان (السلام علیكم)؟

دەڵێت: ئەگەر بۆی دەركەوت زیمی یەكە پـێی ووت: (سـلام علیـك) وە گومـانی نـەبو لـە ووتنەكـەی، ئایـا بـۆی هەیـە بڵێـت (وعلیك السلام)؟ یان تەنها بڵێت: (وعلیك)؟

---

[1] البخاري في الأدب رقم ١١١٣ ، وقال الألباني في تعليقـه عليـه صـحيح، وهـو كمـا قال، ورواه أيضا الطبراني في المعجم الكبير ٢٦٢/١٠ .

ئەوەی بەڵگە شەرعیو یاسا شەرعی یەكان داوای دەكەن، دەبێ پێی بڵێت (وعليك السلام) ئەمەیش لەداد وەریە، خودا فەرمان دەكات بە دادوەریو چاكە، وەك فەرمویەتی: (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا).[1]

واتە: (ئەوسا هەركاتێك سەلامتان لێ كرا وەڵامی ئەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لەخۆی، یان وەكو خۆی).

ئایەتەكە وەڵام دانەوەی وەك خۆی واجب كردووەو داوای باشتری كردوە، ئەمەیش بەهیچ شێوەیەك پێچەوانەی هیچ فەرمودەیەك ناكات لە فەرمودەكانی باسەكە، وەڵام دانەوەی سەلام تەنها بە (وعليكم) لەبەر ئەو هۆیەی باسكراوەو ئەوان سڵاویان پێ كردووە، وەك لە فەرمودەكەی عائیشە ئاماژەی پێكراوەو دەفەرموێت: (ألا ترينني قلت: (وعليكم) لما قالوا (السام عليكم).

واتە: (عائیشە ئایا تۆ نابینی ووتم، (خۆتان)، چونكە ئەوان ووتیان (بمرن)؟ پاشان فەرمووی (إذا سلم عليكم أهل الكتاب فقولوا وعليكم) واتە: (هەركاتێك ئەهلی كیتاب سەلامیان لێ كردن،

[1] سورة النساء آية ٨٦.

ئەوا بڵێن: خۆتان) ئەگەر ئەم حوكمە گشتی بێت ئـەوە گـشتی یـە بۆ هاوشێوەی باسكراو نەك لەوانەی پێچەوانەی دەكات.

خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ وَيَقُولُونَ فِي أَنفُسِهِمْ لَوْلاَ يُعَذِّبُنَا اللَّهُ بِمَا نَقُولُ).[1]

واتە: (هەركاتێك دێنەلات سەلامت لێ دەكەن بەشێوەیەك كـە خودا بەو شێوەیە سەلامی لێ نەكردویتو لەدڵی خۆیانـدا دەیـان ووت: بڵێیت خودا لەسەر ئەوەی كە دەیلێێن سزامان بدات).

ئەگەر ئەم هۆیە نەماو جولەكەو گـاور ووتیـان (سـلام علـیكم ورحمة الله) پێویستە وەك خۆی وەڵامی بدرێتەوە.[2]

جا دوعا كردن بەخەیرو چاكە ڕۆزیو بەرەكەت بۆ ناموسڵمان دروسـتە، وەك خـودا فەرمویـەتی لــە حــاڵی دایـكو بـاوك بـا موشریكیش بن (وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُلْ رَبِّارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا)[3] واتــە: (جـا بـاڵی زەلیلـی خۆتیـان بـۆ ڕابخەو هەمیشە بەسـۆزو میهرەبانیـەوە هەڵسوكەوتیان لەگـەڵ بكەو دوعای خێریان بۆ بكەو بڵێ: ئەی پـەروەردگارم ڕەحمیـان پێ بكە وەك ئەوان ڕەحمیان بەمن كردوە بە منداڵی).

---

[1] سورة المجادلة آية ٨.

[2] أحكام أهل الزمه ١\\٤٢٦.

[3] سورة الاسراء آية ٢٤.

طەبەری دەڵێت: (هەندێك ئەم ئایەتەیان تەئویل كردووە (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوال لِمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَى).[1]

واتە: (پێغەمبەر ﷺ و ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە بۆیان نیە پاش مەرگی موشریكان داوای لێ خۆش بونیان بۆ بكەن ئەگەر چی خزمی نزیكیشیان بن).

خودا داوای لێخۆش بون كردن بۆ موشریكان پاش مردنیان قەدەغە كردووە، وەك دەفەرموێ (من بعد ما تبين لهم أنهم اصحاب الجحيم)[2]واتە: (پاش ئەوەی بۆیان دەركەوت ئەوان دۆزەخین) دەڵێت: ئەمەش كەس ناتوانێت ڕونی بكاتەوە پاش مردنیان نەبێت، هەربۆیە دروستە موسڵمانان داوای لێ خۆش بونیان بۆ بكەن.

سولەیمانی كوڕی عومەری ڕەقی بۆی گێڕاینەوە لە سوفیانی سەوری لە شەیبانی لەسەعیدی كوڕی جوبەیر[3] دەڵێت: پیاوێكی جولەكە مردو كوڕێكی موسڵمانی هەبوو نەڕۆشت لەگەڵ تەرمەكەیدا، ئەمەیان گێڕایەوە بۆ ئیبن عەباس، وتی: پێویستە

---

[1]سورة التوبة آية ١١٣.

[2]سورة التوبة آية ١١٦.

[3]وإسناده صحيح.

چاکەی لەگەڵدا بکاتو دوعای خێری بۆ بکات،جا کاتێك مرد بیسپێرێت بە حاڵی خۆی، پاشان ووتی: خودا دەفەرموێت: (وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلَّا عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ).[1]

واتە: (داواکردنی ئیبراهیم بۆ ئەوەی خودا لە گوناهی باوکی خۆش بێت لەبەر بەڵێنێك بوو کە دابوی بە باوکی، کە وتبوی دوعات بۆ دەکەم، بەڵام کاتێك بۆی دەرکەوت کە دوژمنی خودایەو لێ ی خۆش نابێت، ئیبراهیم بێزاری خۆی دەربڕی)ئیتر دوعای خێری بۆ نەکرد.

ئیبن وەکیع بۆی گێڕاینەوە دەڵێت:فوضەیل بۆی گێڕانەوە لەضیڕاری کوڕی موڕڕە لە سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: پیاوێکی گاور مرد کوڕەکەی تەرمەکەی دایە گاورەکان، جا ڕۆشتم بۆلای ئیبن عەباس ئەمەم بۆ گێڕایەوە، جا ووتی: هیچی لەسەر نەبوو ئەگەر لەگەڵیدا بڕۆشتایەو ئەسپەردەی بکردایەو داوای لێ خۆشبونی بۆ بکردایە؟ پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە (وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لأَبِيهِ إِلاَّ عَنْ مَوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ).[2]

---

[1] سورة التوبة آية ١١٤.

[2] سورة التوبة آية ١١٤.

واتە: (داواکردنی ئیبراهیم بۆ ئەوەی خودا لە گوناهی بـاوکی خۆش بێت لەبەر بەڵێنیك بوو کە دابوی بە باوکی).[1]

ئـیبن حەجـەر دەڵێـت: ئـەبو داود دەیگێڕێتـەوەو حـاکیم بـە صەحیحی داناوە[2] لە فەرمودەی ئەبی موسای ئەشعەری دەڵێت: جولەکـەکان دەپـژمین لـە خزمـەتی پێغەمبـەر ﷺ بـە ئومێـدی ئەوەی بفەرموێت (یرحمکم الله) واتە: (خودا ڕەحمتان پیێ بکات) بـەڵام ئەیفـەرموو (یهـدیکم الله ویـصلُح بـالکم) واتـە: (خـودا هیدایەتان بداتو حاڵتان باش بکات).

ئـیبن دەقیقـی عیـد دەڵێـت: (ئەگـەر بڕوانینـە وتـەی ئـەو زمانەوانانەی کە دەڵێن: وەڵام دانەوەی پژمین دوعای خێرە ئەوا بیێ باوەڕان دەچنە ناو گشت فەرمانی وەڵام دانەوەی بژمین، وە ئەگەر بڕوانینـە وتـەی ئەوانـەی وەڵام دانـەوەی پـژمین تایبـەت دەکـەن بـە ڕەحمـەت، ئـەوە بـیێ بـاوەڕان ناگرێتـەوە،و دەڵـیێ: لەوانەیـە ئەوانـەی وەڵام دانـەوەی پـژمین تایبـەت دەکـەن بـە ڕەحمــەت لەســەر زۆریو گــشتی دایاننــاوەو تایبــەت کردنــی لەفزەکەیە لە زمانەوانیدا.

---

[1] جامع البيان ٦/٤٩٠.

[2] أبو داود في السنن ح رقم ٥٠٣٨ ، والحاكم في المستدرك ٤/٢٩٨ وصححه.

ئـیبن حەجـەر دەڵێـت: (ئـیبن دەقیـق ئـەم باسـەی لـەڕوی زمانەوانیـەوە سەرچـاوە گرتـوە، بـەڵام لەڕوانگـەی شـەرعەوە، فەرمودەکەی ئەبی موسا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی فەرمانە گشتی یەکە ئەوانیش دەگرێتەوە، بـەڵام وەڵام دانەوەیـەکی تایبـەتیان هەیـە کـە دوعـا بـۆ کردنیانـە بـە هیدایـەتو چـاك بونیـان، وە دروستە بە پێچەوانەی وەڵام دانەوەی موسڵمان، ئـەمان دوعـای ڕەحمەتیان بۆ دەکرێ بە پێچەوانەی بێ باوەڕان).[1]

هەروەها ئەم بۆچونەش جێی سەرنجە، ڕەحمەت دەکرێ بۆ دونیا بێت، وەك دوعای چاك بـون کـردن بـۆ ناموسـڵمان کاتێـك بژمی، قورئان فەرمانی کردوە دوعای ڕەحمەت کردن بـۆ دایـكو باوك با موشریکیش بن، بەمەرجێ زیندو بن.

قورطوبی دەڵێت: لە ئایـەتی (وَقُـلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَـا كَمَـا رَبَّيَـانِي صَغِيرًا)[2] واتە: (ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکـە وەك چـۆن ئەوان ڕەحمیان بەمن کردوەو بە منداڵی پەروەردەیان کردوم).

ووتراوە ئەمە بابـەتی نەسـخ نیـە، دوعایـە بـە ڕەحمـەت لـە دونیادا بۆ دایكو باوکی موشـریك کـاتێ زینـدوبن، وەك باسـکرا،

---

[1] فتح الباري ١٠/٦٠٤ ح رقم ٥٨٦٧ .

[2] سورة الاسراء آية ٢٤.

یان مانای گشتی ئایەتەکە تایبەت کراوە بەڕەحمەتی دونیا نەك دوا ڕۆژ، جگە لەوەیش ووتراوە: ئایەتی (وَقُلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَا...)[1] لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دا دابەزیوە، کاتیٚ موسڵمان بوو دایکی خۆی ڕوت کردەوەو چوە بەر بەرخۆرە گەرمەکە، کاتێك ئەمە باسکرا بۆ سەعد: وتی: با بمرێت.ئەوسا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، وەوتراوە: ئایەتەکە تایبەتە بەدوعا کردن بۆ دایك و باوکی موسڵمان، ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو ئایەتە گشتی یە).[2]

بەڵکو دوعا بۆ کردنیان بە (یهدیکم الله ویصلح بالکم) واتە: (خودا هیدایەتتان بداتو حاڵتان باش بکات)، دەگونجیٚ باشتر بێت لە (یرحمکم الله) واتە: (خودا ڕەحمتان پیٚ بکات) یان لە (یغفر الله لکم) واتە: (خودا لێتان خۆش بێت).

ئیبن عبدولبەڕ دەڵێت: (طەحاوی (یهدیکم الله ویصلح بالکم) واتە: (خودا هیدایەتتان بداتو حاڵتان باش بکات)ی هەڵبژاردووە چونکە باشترە لە ( خودا ڕەحمتان پیٚ بکات) یان (خودا لێتان خۆش بێت)، چونکە حاڵی هیدایەت دراو ئەگەر باش بوو لەسەرەوەی لیٚ خۆش بوونەوەیە).[3]

---

[1] سورة الاسراء آية ٢٤.

[2] الجامع لأحكام القرآن ٢٠٧/١٠ .

[3] التمهيد ٣٣٢/١٧، والاستذكار ٤٨٢/٨ .

ئیبن حەجەر دەڵێت: (طەحاوی)لە حەنەفیـەکان ئـەم ڕایـەی پەسەند کردوەو ئایەتی (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا)[1] واتە: (ئەوسا هـەرکاتێك سـەلامتان لێ کـرا وەڵامـی ئـەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لەخۆی، یان وەکـو خـۆی) بـە بەڵگـە هێناوەتەوەو دەڵێت: ئەو کەسەی بـە (غفـرالله لنـا ولکـم) واتـە: (خودا لە ئێمەو لە ئێوە خۆش بێت) وەڵام دەداتـەوە لـە مانـای (یرحمـك الله) واتـە: (خـودا ڕەحمـت پـێ بکـات) زیـاتر ناڵێـت، چـونکە لێخۆشـبون داپۆشـینی تاوانـە وە ڕەحمـەت تۆڵـە نەسەندنەوەیە لێی، بە پێچەوانەی دوعای هیدایەتو حـاڵ بـاش بـوون، ماناکـەی ئەوەیـە، پـارێزراو بێـت لـە تۆڵـە سـەندنەوەی تـاوانو حـاڵ بـاش بـوونو لەسـەروی وەڵامـی یەکەمەوەیـەو باشتریشە) مەبەست لە وەڵام دانەوەی سەلامەکە وەك خۆی بـۆ کەسێکی موشـریك کـاتێ سـەلامی کـردو ووتـی: (الـسلام علـیکم ورحمـة الله وبرکاتـه) دەبێـت بـە (وعلـیکم الـسلام ورحمـة الله وبرکاته) وەڵامی بدرێنەوەو ئیش بە فـەرمودەی ئـەو جولەکانـە ناکرێت لە خزمەتی پێغەمبەرداﷺ دەپـژمینو پێـی دەفـەرمون (یهدیکم الله ویصلح بالکم) واتە: (خوا هیدایـەتان بـداتو حاڵتـان

---

[1] سورة النساء آية ٨٦.

بـاش بكـات) ئەمــە ســونەتە لــە وەڵام دانــەوەی پــژمینی نـا موسڵماندا، بە دوعای هیدایەت بۆ كردنیانو حـاڵ بـاش بونیـان، كە هەمان دوعایە كەسی پژمیو وەڵامی موسڵمانی پێ دەداتەوە كاتێـك پـێی دەڵێـت (یرحمـك الله) واتــە: (خـودا ڕەحمـت پــێ بكات)و وەڵامی دەداتەوە بە (یهـدیكم الله ویـصلح بـالكم) واتــە: (خودا هیدایەتان بداتو حاڵتان باش كات) سەلامی لەسەر قیاس ناكرێت، كـە بـەدەقی ئایـەت فـەرمان كـراوە بـە باشـتر وەڵامـی بدرێتەوە یان وەك خۆی.

# کۆتایی باسەکە

لەکۆتاییـــدا توێـــژەر لێکۆڵینەوەیـــەکی ڕەخنـــە گرانـــەی فـــەرموودەیی کـــردوە بـــۆ فەرمودەکـــەی ســـوهەیل (لاتبـــدؤوا المشركين بالسلام) واتە: (دەستپێشخەر مەبن لە سەلام کردن لە موشریکان).

زانایان بۆچونی جیاوازیان هەیە لەسەر سوهەیل، هەندێك لـە پێشەوایان بە سیقەیان زانیوە وەك ئیمامی ئەحمەدو موسلیم کە ڕەخنەی لێ گیراوە –وەك حاکم باسـی دەکـات– وە هەنـدێ لـە پێشەوایان بەلاوازیان داناوەو نەیان کردوەتـە بەڵگـە وەك ئـیبن مـەعین‌و ئـەبی حاتـەم، بوخـاری فـەرمودەی لێ نەگێڕاوەتـەوەو دارەقوطنی لەسەر ئەوە ڕەخنەی لێ گرتووە.

بـەبێ جیـاوازی ئەوانـەی فەرمودەکـەیان لێ نەگێڕاوەتـەوەو وازیـان لێ هێنـاوە بـەهۆی ئـەو هەڵـەو جیاوازیـە زۆرانـەی لـە فەرمودەکەیدا هاتووە بەهۆی لەبیرکردن‌و لەبیرچـونەوەو لاوازی لەبەرکردنی کە بەهۆی ڕوداوێکەوە توشی بووبـو –پێـشتر بـاس کرا–.

کاتێک توێژەرێك دێت و لێکۆڵینەوەی فەرمودەیەك لە فەرمودەکانی ئەم جۆرە ڕاویانە دەکات و هەڵەو کەمو کوڕی دەبینێت، با کەسەکە ڕاستگۆیی و عەدالەتی دەرکەوتبێ -وەك ئەوانەی متمانەیان پێ کردوەو فەرمودەکەیان بە صەحیح داناوە- بەپێی ئەو لێکۆڵینەوە ڕەخنە گرانە بابەتی یە دەردەکەوێت هەڵەی تێدا کردوەو لێ ی تێك چوەو ئەم فەرمودەیە هەڵەو کەمو کوڕی تێدایە بەم پێیە یەك دەگرێتەوە لەگەڵ ڕای ئەو زانایانەی قسەیان لە سەرکردوەو وازیان لێ هێناوەو خۆیان لە فەرمودەکەی پاراستوە -سەرەتا پێویستە توێژەر هەڵەو کەمو کوڕی یەکەی بسەلمێنێت و پاشان باسی بکات، پێویستە بەپێی توانا ئەو لاوازیەی باس بکات کە بەهەڵەدا چونەکەی دەردەخات، هەروەها پێویستی بە هاوسەنگی نێوان فەرمودەکەو فەرمودەکانی تر دەبێت تا بیسەلمێنێت فەرمودەکە هەندێ هەڵەو کەمو کوڕی تێدایە.

بەلام لەگەڵ ئەو هەڵەو کەمو کوڕییانەش، فەرمودەکە بنچینەیەکی ڕاست و دروستی هەیەو توێژەر لە لێکۆڵینەوە ڕەخنە گرانەکەیدا ڕای هەردولا باس دەکات ئەوانەی متمانەیان پێ داوەو ئەوانەیش بەلاوازیان داناوە.

جا ئەگەر ووترا: سوهەیل خاوەنی متمانەیەو لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە، دەوترێت لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لەوکەسانە نییە زانایان یەك دەنگ بن لەسەری، بەڵکو خاوەنی متمانەیەو قسەی لەسەرە، لە (التقریب)دا دەڵێت: (صدوق تغیر حفظه) ڕاستگۆیەو لەبەرکردنی گۆڕاوە، وە سوهەیل لەو کەسانە نییە بەهێز بێت لەو تاك بونەوەیدا، تەنانەت لەسەر یاسای ئەوانەش متمانەیان پێ پێداوە!

ئەگەر ووترا: سوهەیل لاوازەو بەهیچ شێوەیەك وەرناگیرێت دەوترێت فەرمودەکەی شەواهیدی ڕاستی هەیەو بەگەڕانەوە بۆیان بەهێزی دەکاتو پلەکەی بەرز دەکاتەوە.

ئەمەش لای فەرمودە ناسان زانراوە، کە هەموو کەمو کوڕییەك فەرمودە لاواز ناکات، وە هەموو لێتێکچونێكو جیاوازیەك فەرمودەکە ڕەد ناکاتەوە.

## کەمو کورتی یەکانی فەرمودەکەی (سوهەیل)

بێگومان توێژەر بۆی دەرکەوتووە، ئەم فەرمودەیە (سێ) کەمو کورتی هەیە:

١- سوهەیل لەبەرکردنی لاواز بووەو پێویست بە وردەکاری دەکات هەروەها دورکەوتنەوە لەو هەڵەو لێتێکچونانەی دەگونجێت لە گێڕانەوەکەیدا ڕوبدات.

٢- تاك بونەوەی لە گێڕانەوەی فەرمودەکەدا پێویست بە ڕاوەستان و تێڕامان دەکات لەسەری هەتا (متابعات و شواهد) بەردەست دەبێت و دەیسلەمێنێت کە فەرمودەکە بنچینەیەکی هەیە.

٣- جیاوازی و لێ تێکچون پێویست بە کۆکردنەوەی گێڕدراوەکانی دەکات بۆ دۆزینەوەو دەرکەوتنی ڕاستەکەیان.

کاری توێژەر لە توێژینەوەکەیدا:

**توێژەر هەستاوە بەمانەی لای خوارەوە:**

١- وتەی زانایانی (الجرح والتعديل)ی لەسەر کۆکردوەتەوەو دەرکەوتوە سوهەیل عادیل و ڕاستگۆیەو هەڵە دەکات لە گێڕانەوەکەداو پێویستە تەئکید بکرێتەوە کە هەڵەو لێ تێکچون ڕوی نەداوە لەو فەرمودەیەیدا.

٢- توێژەر ڕیوایەتەکانی فەرمودەکەی کۆکردوەتەوەو دەبنێرێت هاوەڵەزاناو (حُفاظ)ەکانی جیاوازییان هەیە لەسەر لەفزەکانی،جارێك دەڵێت (جولەکە) جارێك دەڵێت (ئەهلی کیتاب) جارێك دەڵێت (مشرکین)(هاوەڵدانەران) ئەم جیاوازییە لە سوهەیلەوەیە نەك لە هاوەڵانی، ناتوانرێت پێکەوە کۆبکرێنەوە لەبەر ئەو جیاوازی جوداییەی تێیدایە وەك لەنێوان (عام و خاص) گشتی و تایبەتدایە،نەك وەك نێوانی ووشە

لێکچووەکانو جیاوازی جۆری بێت، کە پێویست بە وەستانو ڕاگرتنی ئەو لەفزە دەکات، هەتا بەڵگەیەك دەست دەکەوێتو یەکێك لە لەفزەکان لاسەنگو پەسەند دەکات.

٣- هەروەها توێژەر هەستاوە بە گەڕان بەدوای (متابعاتو شواهد)ەکانیو جا بۆی دەرکەوتووە فەرمودەکە تاك بوەتەوەو (نکارە)ی تێدایەو کەس (متابعە)ی نەکردوەو نەیگێڕاوەنەوە نە لەباوکیو نە لە ئەبوهورەیرەو نە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەم لەفزە گشتیو بەربڵاوە، کەسانی وەك سوهەیل ئەم تاك بونەوەی لێوەرناگیرێت، ئەبو حاتمو یەحیای کوڕی موعین دەڵێن (لا یحتج بە) بە بەڵگە دانانرێتو ئیشی پێ ناکرێ، بوخاری فەرمودەی لێ نەگێڕاوەتەوە، ئیبن عەدی ئەم فەرمودەی لەناو فەرمودە غەریبو (منکر)ەکاندا باسکردوە، بەتایبەت (اضطروهم الى أضيق الطريق) واتە: (ڕێگەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کەن) کە بەشێوەی گشتیو بە بڵاوی هاتووە.

٤- پاشان شواهدی ئەم فەرمودەی کۆکردوەتەوە – فەرمودەی ئەبی بەسرەتو جوهەنیو ئیبن عومەر– لەکاتێکدا هەمویان بەسەرهاتێکی درێژ باس دەکەن کە فەرمودە کورتەکەی سوهەیل ڕون دەکاتەوە لەگەڵ ئەم بەشەی

فەرمودەکـــەدا یەکدەگرنـــەوە (إذا لقیــتم الیهــود فــلا تبــدؤوهم بالسلام) واتە: (کاتێـك گەشـتن بـەو جولەکانەئـەوا سـەلامیان لێ مەکەن) وە بەسەرهاتەکەیشی زیاترە لە فەرمودەکەی سوهەیلو ووتــەی: (إنــا غــادون) واتــە: (بەدڵنیاییــەوە ئێمــە ســبەی زوو دەردەچـین)و (وإذا سـلموا علـیکم فقولـوا وعلـیکم) واتــە: (وە هەرکاتێك سەلامیان لێ کردن ئەوا بڵێن:لەسەر خۆتان)ی زیاترە.

ئــەم بەشــەی فەرمودەکــەی ســوهەیل صــەحیحەو لەگــەڵ فـەرمودەکانی تـردا وەك یـەکن، **ووشـەی (المـشرکین) و (أهـل الکتاب) صەحیح نییەو خۆی ووتویەتیو بۆخۆی دەگەڕێتەوەو (متابع وشاهد)یش نییە .**

وەگێڕانەوەکـەی وەکیـع لـە سـەوری بـە (الیهـود) ڕیوایـەتی کردووە لەگەڵ فەرمودەکانی تردا یەکدەگرنەوە.

کەواتە ئەم فەرمودەیـە لـە بەسـەرهاتێکدا هـاتووە ماناکـەی ئاشکرا دەکات، حوکمی گشتیو بەربڵاوی نییەو سوهەیل کورتی کردوەتـەوەو تێکیـداوە یـان لـەبیری چـووە، یـا خـۆیو بـاوکی ئیجتیهادیان تێداکردووە، (ئەهلی کیتاب)و (گاورەکانی) شام یان قیاس کردوەتە سەر ئەو جولەکانەی فەرمودەکە لە بارەیانـەوە هاتووە، یان بـە ئیجتیهـادی خـۆی فەرمودەکـەی بـاس کـردوە، لەکاتێکــدا (ئەبوبەســـرەتی غیفــاریو ئـــەبو عەبـــدڕڕەحمانی

جوهـــەنیو عبـــدالله ی کـــوڕی عومـــەر) باســـیان کـــردوە لـــەناو فـــەرمودەی دەرچـــونی پێغەمبـــەر ﷺ بـــۆ گـــەمارۆدانی بـــەنی قورەیزە، نەهی لە هاوەڵانی کردوە سەلامیان لێ بکەن، فەرمانی پێ کردون تەنها بە (وعلیکم) وەڵامی سەلامیان بدەنـەوە. هـەتا سەلام کردنەکـە نەبێتـە ئـەمنو ئـەمان بۆیـانو ئـەمان نـەتوانن لەگەڵیانـدا بجـەنگن، هـەروەك فـەرمانی پێکـردون ڕێگـەیان لێ تەسك بکەنەوەو لاڕێ یان کـەن، چـونکە ئـەو هـاتوە بجـەنگێت لەگەڵیان نەك سەلامو ئاشتی بەرپا بکات لەناویاندا.

چوارەم: هـەروەك فـەرمودەی صـەحیحو گـشتی هـاتووە لـە کۆمەڵێك لە هاوەڵان لەوانە:

(بەڕائی کوڕی عازیبو عبدالله ی کوڕی سەلامو عبدالله کـوڕی عومـــەرو ئـــەبی ئومامـــەی بـــاهلی)، کـــە فـــەرمان دەکـــات بـــە بڵاوکردنەوەی سەلام لە هەموو خەڵکی ئەوەی دەیناسنو ئەوەی نایناســـن، ئـــەم فەرمودانـــە لەگـــەڵ مانـــای گـــشتی ئایەتـــە قورئانیەکاندا یەك دەگرنەوە.

پێنجەم: سـوننەتی کـرداری پێغەمبـەر ﷺ لەگـەڵ سـونەتی وتـاری یـەك دەگرێتـەوە، چەسـپاوە پێغەمبـەر ﷺ هـاتوە بـۆ مەجلیسێکی تێکەڵ لە موشریكو جولەکـەو موسـڵمانو سـەلامی

لــه هــەمویان کــردوەو بــانگی کــردون بــۆ ئیــسلامو قورئــانی بەسەریاندا خوێندوەتەوە.

شەشەم: هەروەها چەسپاوە لـە کۆمـەڵێك لـە هـاوەڵان وەك (ئـیبن مەسـعودو ئـەبی ئومامـەی ئـەلباهلی، لەفەزالـەی کـوڕی عوبەیدو ئەبودەرداو ئیبن عەباس) کە ئەوان سەلامیان دەکرد لە ناموســڵمان، یــان ســەلامیان دەکــرد لــە هەرکەســێك پــێی بگەشـتنایە موسـڵمان بوایـە یـان نـا موسـڵمان بـەپێی حـوکمی گشتی دەقەکانی قورئانو فەرمودە.

(نەخەعیو ئیبن عوەینەو ئەوزاعی) سەلام کردنیان بەدروست زانیوە، قورطـوبی سـەلماندویەتی ئـەوەی ڕونو ئاشـکرابێت لـە دەقە قورئانیەکاندا سەلام کردنە، ئەگەر فـەرمودەی سـوهەیل نەبوایە، وە ئیسحاقی کوڕی راهەویە و طەبەری هاوڕان لەگەڵیان دا، ئەگەر هۆیەك هەبوو پێویستی دەکرد سـەلامیان لێ بکرێـت وەك هاوڕێ یەتیو پێویـستیو دراوسـێیەتیو سـەفەرو هۆکـاری تر، کەواتە ڕای پەسـەند دروسـتە سـەلام کـردن بـەپێی بەڵگـە گشتی یەکان، وە تـەنها لەکاتی جەنگ دا دروست نیە سـەلامیان لێ بکرێت.

حەوتەم: ڕاستو دروست لە وەڵامدانەوەی کەسێك سەلامی کرد موسڵمان بێت یان ناموسڵمان، وەڵام دانەوەیەتی بە جوانترین شێوە یان بەو شێوەیەی خۆی، بەپێی ئایەتی (وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا).[1]

واتە: (ئەوسا هەرکاتێك سەلامتان لێ کرا وەڵامی ئەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لەخۆی، یان وەکو خۆی).

هەشتەم: وەڵام دانەوەی نا موسڵمان بە (وعلیکم) بێگومان تەنها لە دوو کاتدایە:

١- کاتی جەنگ هەتا سەلام کردن نەبێتە ئەمنو ئەمان.

٢- لەکاتی دوعا کردن بەشەرو خراپە، ئەوە تەنها بە (وعلیکم) وەڵام دەدرێنەوە، لەوە زیاتری لەگەڵدا ناکرێت، ئەمەیش لە ڕەوشتو سۆزو میهرەبانی ئیسلامە بۆ هەموو خەڵکی.

نۆهەم: هەرکەسێکی ناموسڵمان بە (السلام علیکم ورحمة الله) سەلامی کرد، پێویستە وەك خۆی وەڵامی بدرێتەوە، ئیبنو قەیم ئەمەی بە پەسەند زانیوە، بەپێی دەقە قورئانیەکان.

---

[1] سورة النساءآیة ٨٦

دەهـــەم: ئـــەم ڕەوشـــتە قورئـــانیو پێغەمبەرایەتیانـــە لـــە جوانیـــەكانی ئیـــسلامو ڕەحمـــەتو میهرەبانیـــەتی بەهـــەمو مرۆڤایەتی، لەتەواویو گەورەیی ئەو شەریعەتە پاكو بێگەردەیە كە دادوەریو چاكەو ڕێزو بەزەییو میهرەبانی بەدی هێناوە بـۆ ڕێكخستنی پەیوەندی نێوان موسڵمانانو ناموسڵمانان.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

سوپاس بۆ خودای گەورەو میهرەبان تەواو بوو

# المراجع والمصادر


- الأدب المفرد: محمد بن إسماعيل البخاري، تحقيق فؤاد عبد الباقي، الطبعة الثالثة سنة ١٤٠٩هـ، البشائر، بيروت.
- الإحسان بترتيب صحيح ابن حبان:ترتيب ابن بلبان، تحقيق:شعيب الأرنؤوط الطبعة الثانية ، ١٤١٤ – ١٩٩٣ ، مؤسسة الرسالة – بيروت.
- أحكام أهل الذمة: محمد بن أبي بكر ابن قيم الجوزية، تحقيق : يوسف أحمد البكري – شاكر توفيق العاروري، الطبعة الأولى ، ١٤١٨ – ١٩٩٧، رمادى للنشر – دار ابن حزم – الدمام – بيروت.
- الاستذكار: أبو عمر يوسف بن عبد الله بن عبد البر، تحقيق:سالم محمد عطا ومحمد علي معوض الطبعة الأولى ١٤٢١ – ٢٠٠٠، دار الكتب العلمية – بيروت.
- إعلام الموقعين :محمد بن أبي بكر ابن قيم الجوزية، تحقيق محمد محيي الدين عبد الحميد طبعة دار الفكر ، بيروت .
- الإلزامات والتتبع: الدارقطني، تحقيق مقبل الوادعي، دار الكتب العلمية، بيروت.
- التاريخ الكبير : محمد بن إسماعيل البخاري، ط سنة ١٣٦١هـ ، إدارة المعارف العثمانية، الهند.
- التحرير والتنوير: الطاهر بن عاشور ، طبعة أولى مصورة.
- تحفة الأشراف: أبو الحجاج يوسف بن الزكي المزي، تحقيق عبد الصمد شرف الدين، ط٢ سنة ١٤٠٣هـ، المكتب الإسلامي، بيروت.

- تفسير ابن كثير :أبو الفداء إسماعيل بن عمر ابن كثير، طبعة سنة ١٤١٣هـ، دار المعرفة ، بيروت.
- تفسير القرطبي ـ الجامع لأحكام القرآن ـ محمد بن أحمد بن فرح القرطبي، طبعة سنة ١٤٠٥هـ ، دار إحياء التراث العربي ، بيروت.
- تفسير الطبري ـ جامع البيان ـ: محمد بن جرير الطبري، الطبعة الأولى سنة ١٤١٢هـ، دار الكتب العلمية، بيروت.
- التقريب: أحمد بن علي ابن حجر، تحقيق محمد عوامة، ط٣ سنة ١٤١١هـ، دار الرشيد، سوريا.
- التقييد والإيضاح : زين الدين العراقي، تحقيق عبد الرحمن عثمان، ط ١٩٦٩، المكتبة السلفية، المدينة المنورة.
- التمهيد: يوسف بن عبد البر ، طبعة ثانية سنة ١٤٠٢هـ ، وزارة الأوقاف المغربية.
- تهذيب التهذيب: أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني، الطبعة الأولى ، ١٤٠٤ – ١٩٨٤، دار الفكر ، بيروت.
- تهذيب الكمال: المزي، تحقيق بشار عواد، ط١ سنة ١٤١٣هـ، الرسالة، بيروت.
- توجيه النظر : طاهر الجزائري، تحقيق أبو غدة، ط١ سنة ١٤١٦، مكتب المطبوعات الإسلامية، حلب.
- توضيح الأفكار: الصنعاني، تحقيق صلاح عويضه، ط ١ سنة ١٤١٧، الكتب العلمية، بيروت.
- الثقات: ابن حبان، ط١ سنة ١٣٩٣هـ ، دائرة المعارف العثمانية ، الهند.

- الجامع الصحيح المختصر:محمد بن إسماعيل البخاري، تحقيق مصطفى البغا، الطبعة الثالثة ١٤٠٠ — ١٩٨٧، دار ابن كثير، اليمامة — بيروت.
- جامع التحصيل : العلائي، تحقيق حمدي السلفي، ط٢ سنة ١٤٠٧، عالم الكتب، بيروت.
- الجامع: الترمذي، تحقيق أحمد شاكر ، وكمال الحوت ، دار الكتب العلمية، بيروت .
- الجرح والتعديل: ابن أبي حاتم، تحقيق المعلمي، ط١ سنة ٣٧٢هـ دائرة المعارف العثمانية، الهند.
- حلية الأولياء : أبو نعيم الأصبهاني، دار الكتب العلمية ، بيروت.
- الدر المنثور :جلال الدين السيوطي، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية، بيروت.
- ذخيرة الحفاظ: ابن طاهر المقدسي، تحقيق الفريوائي، ط ١ سنة ١٤١٩، السلف، الرياض.
- الرفع والتكميل: عبد الحي اللكنوي، تحقيق عبد الفتاح أبو غدة، ط ٣ سنة ١٤٠٧، مكتب المطبوعات، حلب.
- زاد المعاد في هدي خير العباد: محمد بن أبي بكر ابن قيم الجوزية، تحقيق :شعيب الأرناؤوط وعبد القادر الأرناؤوط، الطبعة الرابعة عشر ، ١٤٠٧ — ١٩٨٦، مؤسسة الرسالة ـ بيروت.
- سلسلة الأحاديث الصحيحة، محمد ناصر الدين الألباني، الطبعة الرابعة سنة ١٣٩٨هـ ، المكتب الإسلامي ـ بيروت.
- سلسلة الأحاديث الضعيفة:محمد ناصر الدين الألباني، الطبعة الرابعة سنة ١٣٩٨هـ ، المكتب الإسلامي، بيروت.

- السنن :سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني، ، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد، دار الفكر.
- السنن :محمد بن يزيد بن ماجه، تحقيق فؤاد عبد الباقي ، طبعة أولى، المكتبة الإسلامية اسطنبول.
- السنن الصغرى:أحمد بن شعيب النسائي، بعناية عبد الفتاح أبو غدة، ط٢ ١٤٠٩هـ البشائر، بيروت.
- السنن الكبرى: أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق البنداري، ط١ سنة ١٤١١هـ، دار الكتب العلمية، بيروت .
- السنن الكبرى: أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي، الطبعة الأولى، دائرة المعارف العثمانية، تصوير دار المعرفة، بيروت.
- سؤالات الحاكم للدارقطني : الحاكم ، تحقيق موفق عبد القادر، ط ١ سنة ١٤٠٤، دار المعاف، الرياض.
- سؤالات السلمي للدارقطني: السلمي، تحقيق طلال الحيان، ط ١ سنة ١٩٩٥ .
- سير أعلام النبلاء :محمد بن أحمد الذهبي، تحقيق جماعة، ط٩ سنة ١٤١٣هـ، الرسالة، بيروت.
- شرح سنن أبي داود : بدر الدين العيني، ط ١ سنة ١٤٢٠ هـ، مكتبة الرشد، الرياض.
- شرح علل الترمذي : ابن رجب، نور الدين عتر، ط ١ دمشق.
- شعب الإيمان:أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي، تحقيق : محمد السعيد بسيوني زغلول
- الطبعة الأولى ، ١٤١٠ دار الكتب العلمية — بيروت.

- صحيح مسلم بن الحجاج بشرح محي الدين النووي: ط٣ سنة ١٤٠٤ نشر دار إحياء التراث العربي بيروت.
- صحيح مسلم :مسلم بن الحجاج، ترقيم عبد الباقي، ط١، المكتبة الإسلامية، استانبول.
- صيانة صحيح مسلم: ابن الصلاح، تحقيق موفق عبد القادر، ط٢ سنة ١٤٠٨، دار الغرب، بيروت.
- ضعيف الأدب المفرد : محمد ناصر الدين الألباني، الطبعة الأولى سنة ١٩٩٤م ، دار الصديق .
- الطبقات: محمد بن سعد، تحقيق محمد عبدالقادر، ط١ سنة ١٤١٠هـ دار الكتب العلمية، بيروت.
- طبقات المدلسين: أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، تحقيق: د. عاصم بن عبدالله القريوتي، الطبعة الأولى ، ١٤٠٣ – ١٩٨٣، مكتبة المنار – عمان.
- علوم الحديث : ابن الصلاح ، ط ١ سنة ١٩٨٤م، مكتبة الفاربي.
- الفوائد:تمام بن محمد الرازي أبو القاسم، تحقيق : حمدي عبد المجيد السلفي، الطبعة الأولى ، ١٤١٢، مكتبة الرشد – الرياض.
- فتح الباري: أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، تحقيق محب الدين الخطيب، ترقيم عبد الباقي ط١ سنة ١٤١٠هـ نشر دار الكتب العلمية، بيروت .
- الكاشف : محمد بن أحمد الذهبي ، تحقيق عوامة ، الطبعة الأولى سنة ١٤١٦هـ، دار القبلة، جدة.

- الكامل في الضعفاء: عبد الله بن عدي الجرجاني، تحقيق سهيل زكار، ط٣ سنة ١٤٠٩، دار الفكر، بيروت.
- كشف المشكل: ابن الجوزي، تحقيق علي البواب، ط ١ سنة ١٤١٨، الوطن، الرياض.
- لسان الميزان: أحمد بن علي ابن حجر، ط١ دار الكتاب الإسلامي، القاهرة .
- المجروحين: محمد بن حاتم بن حبان، تحقيق محمود زايد، ط٢ سنة ١٤٠٢هـ دار الوعي، حلب.
- مسائل الأمام أحمد وإسحاق بن راهويه: رواية إسحاق بن منصور، تحقيق خالد الرباط وجماعة، ط١ ١٤٢٥ هـ دار الهجرة ـ الرياض.
- مجمع الزوائد :أبو بكر الهيثمي، الطبعة الثالثة سنة ١٤٠٢هـ، الكتاب العربي ، بيروت.
- مجموع الفتاوى: أحمد بن عبد الحليم ابن تيمية، جمع ابن القاسم، طبعة سنة ١٤١٢هـ عالم الكتب، الرياض.
- المستدرك على الصحيحين: محمد بن عبدالله الحاكم النيسابوري، ترقيم:مصطفى عبد القادر عطا، الطبعة الأولى ، ١٤١١ – ١٩٩٠ دار الكتب العلمية، بيروت.
- المستدرك: محمد بن عبدالله الحاكم ط١ سنة ١٣٣٥هـ دائرة المعارف العثمانية .
- المسند: أحمد بن حنبل، ط٣، تصوير المكتب الإسلامي .
- المسند : أحمد بن حنبل ، تحقيق أحمد شاكر، ط١ سنة ١٣٧٧هـ، دار المعارف، القاهرة.

- المسند : علي بن الجعد ، تحقيق عامر أحمد، ط ١ سنة ١٤١٠، مؤسسة دار نادر، بيروت.
- مسند الشاميين: سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني، تحقيق :حمدي بن عبد المجيد السلفي، الطبعة الأولى ، ١٤٠٥ — ١٩٨٤، مؤسسة الرسالة — بيروت.
- مسند أبي يعلى: أحمد بن علي بن المثنى أبو يعلى الموصلي التميمي، تحقيق :حسين سليم أسد، الطبعة الأولى ، ١٤٠٤ — ١٩٨٤، دار المأمون للتراث — دمشق.
- المصنف: أبو بكر بن أبي شيبة، تحقيق كمال الحوت ، طبعة أولى سنة ١٩٨٨م بيروت.
- المصنف:عبد الرزاق بن همام الصنعاني، تحقيق حبيب الرحمن الأعظمي ط١ سنة ١٩٨٢م المكتب الإسلامي، بيروت .
- المعجم الأوسط : سليمان بن أحمد الطبراني، تحقيق محمود الطحان، الطبعة الأولى سنة ١٤٠٥هـ، المعارف، الرياض.
- المعجم الكبير: سليمان بن أحمد الطبراني، تحقيق حمدي عبد المجيد، ط٢، وزارة الأوقاف العراقية.
- الموطأ:مالك بن أنس، تحقيق عبد الباقي، طبعة سنة ١٤٠٦هـ ، دار إحياء التراث العربي .
- الموضوعات : ابن الجوزي، ط دار المعرفة ، بيروت.
- النكت على ابن الصلاح : بدر الدين الزركشي، تحقيق زين العابدين فريج، ط ١ سنة ١٤١٩ هـ ، دار أضواء ، الرياض.
- النكت على ابن الصلاح : ابن حجر، تحقيق ربيع المدخلي، ط١ سنة ١٤٠٤ هـ ، مركز البحث العلمي، المدينة المنورة.

## له بڵاوکراوەکانی گۆڤاری خاڵ

١. ئەدەبی گاڵتەوگەپ. ن: تۆفیق کەریم

٢. پێکەوەژیان: بەرەو بەخۆداچوونەوەو گۆرانکاریی. ن: نازم عەبدوڵڵا

٣. پێوەرەکانی سەرکەوتنی رێکخستن و دوانەییە سەرەکییەکانی. و: تۆفیق کەریم

٤. حرية المعتقد وإشكالية قتل المرتد. د. بختيار نجم الدين شمس الدين

٥. سوننەی سیاسی لە درووستکردن و ڕاپەڕاندنی دەسەڵاتدا. و. ئیسماعیل تەها

